عەلی نەقی ئەلحوسەینی

# مێژووی ٦٤١ ساڵەی فەرمانڕەوایی ئەردەڵانییەکان

## لە ناوچەی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی ئێراندا

وەرگێڕانی لە فارسییەوە

**ئاسۆس هەردی**



پیاچوونەوەی

**حەسەن عەبدولکەریم**

عەلی نەقی ئەلحوسەینی

# مێژووی ٦٤١ ساڵەی فەرمانڕەوایی ئەردەڵانییەکان لە ناوچەی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی ئێراندا

وەرگێڕانی لە فارسییەوە

ئاسۆس هەردی

پیاچوونەوەی

حەسەن عەبدولکەریم

سلێمانی ٢٠٠٢

- ناوی کتێب: مێژووی ٦٤١ ساڵەی فەرمانڕەوایی ئەردەڵانییەکان...
- ناوی نووسەر: عەلی نەقی ئەلحوسەینی
- ناوی وەرگێڕ: ئاسۆس هەردی
- بابەت: مێژوویی
- مۆنتاژ: سەیران عبدالرحمن
- تیراژ: ٦٠٠ دانە
- ژمارەی سپاردن : (٤٤٢)ی ٢٠٠١
- چاپی یەکەم : سلێمانی ٢٠٠٢
- کۆمپیوتەرو ئۆفسێتی دەزگای سەردەم

زنجیرە کتێبی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم (١٦٣)

# پێشەکی

ئـەم دەستنووسـە لەسـاڵی ١٣٢١ی کۆچیـدا نووسـراوەتەوەو تایبەتـە بـە مێــژووی میرنشینی ئەردەڵان. نووسەرەکەی نـاوی (عـەلی نـەقی ئەلحوسـەینی)یـەو وەکـو خـۆی باسی دەکات، لەوالیو میرو دەسەڵاتدارانی سـەردەمی خۆیـەوە نزیـك بـووە. لەهـەندێك رووداودا ڕاستەوخۆ بەشدار بووەو هەندێکی تریشـیانی لـەو دەسـەڵاتدارانەوە بیسـتووە کە لەناوجەرگەی ڕووداوەکاندا بوون.بەهەمان شێوە باوکیشی لای دەسەڵاتداران هەمان پلەوپایەی هەبووەو ئەویش یەکێك بووە لــەو سـەرچاوانەی پشـتی پێبەسـتوون. بـەڵام سـەبارەت بـە سـەرچاوەکانی بـۆ نووسـینەوەی مێـژووی ڕووداوەکــانی دوورتــر، هیـــچ زانیارییەکی لەدەستنووسەکەدا تۆمار نەکردووە.

بێگومان هەڵسەنگاندنی ناوەرۆكو زانیارییە مێژووییەکانی ئەم دەستنووسـە، کـاری مێژوونووسانو بەتایبەت شارەزایانی مێـژووی ئەردەڵانـە. لەڕاسـتیدا هـەوڵێکی زۆرم دا کەسێکی لەو جۆرە بەم دەقــەدا بچێتـەوەو پێشـەکیو پـەراوێزی بـۆ بنووسـێت، بـەڵام بەداخەوە ڕێکنەکەوت. هەرچۆنێك بێت، خوێنەری ئاسایی کە ئەم دەقە دەخوێنێتەوە، بۆی دەردەکەوێت کە نووسەرەکەی بێلایەن نەبووەو زۆرتر بـەلای والیو دەسـەڵاتدارانی سەربە دەوڵەتی ئێراندا دایشکاندووە. بەجۆرێك کـە ڕوحیـەتی ئـێرانچێتی بەئاشـکرا بـە بۆچوونو هەڵسەنگاندنەکانیەوە دیارە.

بەدەر لەزانیارییە مێژووییەکانو شوێنو ساڵی ڕووداوەکان، دەستنووسـەکە گـەلێك زانیاری تـری تێدایـە لەسـەر عەقلیـەتو شـێوەی بیرکردنـەوەی میرەکـانی ئـەردەڵانو، چۆنیــەتی ڕەفتــاری دەوڵــەتی ئــێران لەگــەڵ میرنشــینی ئـــەردەڵانو نـــەیارەکانی خۆیانداو..هتد. ئەمەش بێگومان سەرچاوەیەکی دەوڵەمــەند دەبێـت بـۆ ئـەو نووسـەرو

لێکۆڵەرانەی گرنگی بە مێژووی کۆمەڵایەتی کوردو خوێندنەوەی تیۆریی کۆمەڵگای کوردی دەدەن.

لەلایەکی ترەوە، نووسەر لەچەند شوێنێکدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەم دەقە پوختەی کتێبێکی ترە کە ناوی (تاریخ الاکراد)ەو بەدرێژی باسی زۆربەی ئەم ڕووداوانەی تێدا نووسیوەتەوە. هەوڵم دا لەڕێگەی چەند دۆستو نووسەرێکی کوردستانی ئێرانەوە هەندێ زانیاریم سەبارەت بەو کتێبەو ژیاننامەی نووسەر دەسکەوێ، بەڵام ئەویش ئەنجامێکی ئەوتۆی نەبوو.

خودی دەستنووسەکە بە خەتێکی جوانی فارسی لەسەر (١٤٥) لاپەڕەی قەبارە گەورە نووسراوەتەوە. لاپەڕەی یەکەمی نووسینەکە وەکو بەرگی کتێبەکە وایەو ناونیشانەکەی لەسەر نووسراوە، بەڵام ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ، ئەگەرچی لەناونیشانەکەدانووسراوە: "مێژووی ٦٤١ساڵی کوردستان.. لەساڵی ٦٤ ٥ی کۆچییەوە تا ساڵی ١٣٠٥ی کۆچی"، بەڵام جیاوازیی نێوان ئەم دووساڵە دەکاتە (٧٤١ساڵ) نەک (٦٤١).

لەو ڕووەشەوە کە مێژووی نووسینی دەگەڕێتەوە بۆ پتر لە(١٠٠)ساڵ لەمەوبەر، هیچ جۆرە خاڵبەندییەکی تێدا نیە، بە ڕێنووسی کۆنی فارسی نووسراوەتەوە (بۆنموونە هەردوو پیتی ك وگ بەیەك شێوەو بە ك نووسراون)، شێوازی داڕشتنی پڕە لە هونەری نووسینی سەردەمی خۆی، وەکو سەجعو جۆرەکانی تری ڕەوانبێژیو دێڕە شیعری جۆراوجۆر، لەهەندێ شوێنی کەمدا مانای ڕستەکان ڕوونو ئاشکرا نینو جۆرێك تێکەڵو پێکەڵییان پێوە دیارە (لەشوێنی خۆیاندا ئاماژەیان بۆ کراوە)، ئەمەش وامان لێدەکا کەبڵێین نووسەر خۆی دەستنووسەکەی نەنووسیبێتەوەو ئەو کەسەش کە نووسیویەتەوە، لەنووسینەوەی هەندێك ناوو داڕشتنەوەی هەندێك ڕستەدا وردبین نەبووبێت.

ئەوەندەی توانیبێتم، هەوڵم داوە لەپەراوێزدا زانیاری پێویست سـەبارەت بەشـوێن، ناوەکانو هەندێ ڕووداوی دیار پێشکەشی خوێنەر بکەم. بـەڵام وەك ئامـاژەم بـۆ کـرد، هەڵسەنگاندنو بەدواداچوونی وردی دەقەکە، بەجێدێڵم بۆ مێژوونووسان.

دواجـار وەکـو نووسـەر خـۆی لـەکۆتاییدا دەڵێـت، ئـەم دەقـە لەسـەر داوای مامۆستایەکی زانکۆی بەرلین نووسراوە کەناوی (مسیۆ دکتۆرمان) بووەو لەگەڵ خۆیـدا بردوێـتی بـۆ ئـەڵمانیا. دواتـر کۆپییـەکی لەئـەڵمانیاوە هێنراوەتـەوە بـۆ کوردسـتانو تەسلیمی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم کراوە، بۆ وەرگـێڕانو لـەچاپدانی. دەزگـای نـاوبراویش ئـەم ئەرکـەیان بـەمن سـپارد. هیـوادارم سـەرچاوەیەکی بەسـوود بێـت بـۆ سەردەمێکی گرنگ لەمێژووی کوردستان.

لەکۆتاییدا بەپێویستی دەزانم زۆر سوپاسی مامۆستا (حەسەن عەبدولکـەریم) بکـەم کە ئەرکی پێداچوونەوەی ئەم وەرگێڕانەی گرتە ئەسـتۆ. هـەوڵو مـاندووبوونی بـەڕێزی نەبوایە، ڕەنگ بوو بڵاوبوونەوەو لەچاپدانی ئەم بەرهەمە زۆر دوابکەوتایە.

**ئـاسۆس هەردی**

**٢٤ /٣/ ٢٠٠٢**

## ڕەچەڵەکی ئەردەڵان کە باپیرە گەورەی کاربەدەستانی کوردستانەو مێژووی ڕووداوو بەسەرهاتەکانی کوردستان لە ساڵی ٥٦٤ی کۆچییەوە تا ساڵی ١٣٠٥ی کۆچی.

سەبارەت بە ڕەچەڵەکی ئەردەڵان، کە بنەماڵەی کاربەدەستانی کوردستان نەوەی ئەون و بە ناوی ئەوەوە بەناوبانگن، بۆچوونی جیاواز هەیە. هەندێك کەس بە کوڕی (ئەردەشیری بابەکان)ی دەزانن، هەندێکی تر بە کوڕی ئەو (خەسرەو) ناوە ئاشەوانەی دەزانن، کە بکوژی (یەزدگرد)ی پاشای عەجەم بوو، و بە هۆی ڕشتنی خوێنی پاشایەکی ئاواوە، ناوی لە لاپەڕەی ڕۆژگاردا مایەوەو کوڕو کوڕەزاکانی بێئەندازە بەرزبوونەوە. هەندێکیش دەڵێن ئەم ئەردەڵانە ناوی خەسرەو بووەو ئاشەوان بووە. لە زەمانی (سەففاح ئەبولعەباس ئەحمەد عەباس)دا، بە یاریدەی ئەبو موسلیم (مەرڤەزی)[1] دەستی بەسەر کوردستاندا گرت. بە هۆی ئەمەوە بە (ئەردەڵان) ناوی دەرکردو بە کوڕو کوڕەزاکانیشی دەڵێن (بەنی ئەردەڵان).

بەهەرحاڵ، ئەردەڵان لەگەڵ کەسوکارەکەی خۆیدا، ماوەیەك لە موسڵو دیاربەکر گەورەو سەرۆك بووە، (پاشان) بەپێی قەدەرو چارەنووس، لەگەڵ کۆمەڵێك لە تایەفەو دەستوپێوەندەکانی خۆیدا کۆچیان کردووەو هاتوون بۆ شارەزوور. لە ساڵی ٥٦٤ی کۆچییەوە، لەو ناوچەیەدا حکومەتی سەربەخۆی بەدەستهێنا، قەڵای (زەڵم)ی لەوپەڕی پتەویو قایمیدا دروستکرد بۆ ئەوەی ببێتە شوێن و (خانەی حکومەت– دار الحکومە)ی خۆی. دەستی بەسەر دەوروبەری شارەزووردا گرت و زۆربەی کوردستانی خستە ژێردەستی خۆیەوە. هەروەها (پلنگان)یشی گرت کە شوێن و مەسکەنی (کەلهوڕ) و گەورەپیاوانی کەلهوڕ بوو. ئەردەڵان خۆی هاتۆتە ئەوێو قەلایەکی ئێجگار پتەوی لەوێ بنیاتناوە کە پاشماوەی هەتا ئێستاش هەرماوە. ماوەی چل ساڵ لەم ناوچەیەی کوردستاندا خاوەن بڕیارو فەرمانڕەوای بە دەسەڵات بووە. لە کۆتاییەکانی ژیانیدا، بە فەرمانی (چەنگیزیان–چنگیزیان)[2] (کۆیە) و (حەریر) و (شارباژێڕ) و (ڕەواندز) و (ئامێدی) خراونەتە سەر قەڵەمڕەوەکەیو لە ساڵی (٦٠٦)ی کۆچیدا، کۆچی دوایی کردووە.

## فەرمانڕەوایی ( کڵوڵ )ی کوڕی ئەردەڵان لە کوردستاندا

لە هەمانساڵدا، (کڵوڵ)ی کوڕی لە جێگەی باوکی دامەزراو بووە خاوەن دەسەڵات. بە هۆی ئازایەتیو جوامێری خۆیەوە، قەڵەمڕەوی باوکی فراوانکردو (سەقز)و (زەرین کەمەر– زرین کمر) و (گەروس) و (سیاکۆ– سیاه کوه)[٣]ی خستە سەر قەڵەمڕەوەکەی خۆی، کە ئەمەی دواییان قەڵەمڕەوی (علی شکر)[٣]ەو ئێستا بە (ئسفەند ئاباد– اسفند اباد) بەناوبانگە. بیست و سێ ساڵ بەوپەڕی سەربەخۆییەوە، فەمرانڕەوایی کردو کۆچی دوایی کرد.

## باسی فەرمانڕەوایی ( خدر- خضر )ی کوڕی کڵوڵ لە کوردستاندا

لە ساڵی (٦٢٩ک)دا، خدری کوڕی کڵوڵ بە پێی میراتی، ئالای سەرۆکایەتی لەسەر قەڵەمڕەوی باوك و باپیری هەڵکردو سیو چوار ساڵ بەوپەڕی ئینساف و دادپەروەرییەوە، لە کوردستاندا فەرمانڕەوایی کرد. ڕۆژگاری ژیانی لە ساڵی (٦٦٣)دا تەواوبوو.

## باسی ( ئەلیاس )ی کوڕی خدرو فەرمانڕەوایی ئەو لە کوردستاندا

لە هەمان ساڵدا (ئەلیاس)ی کوڕی، بووە جێنشینی باوکی، ئەم ئەلیاس ناوە بێئەندازە ئازاو بەخشندە بوو. هەر ئەم دوو سیفەتەش بووبوونە مایەی ترس و هیوای خەڵکی وڵات. چل و حەوت ساڵ لە کوردستاندا فەرمانڕەوایی کردو لە ماوەی حوکمڕانی ئەودا، ئاسایش بە تەواوی بەرقەراربوو. لە ساڵی (٧١٠ک)دا کۆچی دوایی کرد.

## باسی حکومەتی ( خدر ) لە کوردستاندا کە بە ( خدری دووەم ) بەناوبانگە

لە هەمان ساڵدا، (خدر)ی کوڕی جلەوی سەرۆکایەتی گرتەدەست. ئەم خدر ناوە، کە بە خدری دووەم بەناوبانگە، بێئەندازە پاك و لە خواترس بوو. ڕۆژگاری ژیانی بە عیبادەتی پەروەردگار دەبردە سەرو بە هیچ جۆرێك حوکمی ناڕەواو ستەمی لە

رەعیەت و ژێردەستانی خۆی نەدەکرد. بەلکو تەنانەت وەرگرتنی باجی عادەتیشی لە رەعیەتی خۆی بە پێچەوانەی ریسای شەریعەت و تەریقەت دەزانیو هەر بەوەندە قایل بوو کە لە قەلەمرەوی فەرمانرەوایی ئەودا، بێ نەزمی روونەدات. دەولەتی عوسمانی کە باسی لە خواترسیو پاکیی خدریان بیست، لە ناکاو لەشکریان هینایە ناو مەملەکەتەکەیەوە. خدریش بێ شەرو خوین رشتن لە گەلیاندا ریککەوت و سنووری خۆرئاوای کوردستانی لە (شارباژێر)ەوە تا (هەولیر–اربیل) و (کۆیە) و (حەریر) و (ئامیدی) و (رەواندز)، دا بە وان و بە ناوچەکانی تری خۆرهەلات و باشووری خۆرهەلاتی قەلەمرەوەکەی قایل بوو. پاش ماوەی سیو شەش سال فەرمانرەوایی، روویکردە دیاری ئەبەدییەت.

## باسی حکومەتی ( حەسەن )ی کوری خدری دووەم لە کوردستاندا

(حەسەن)ی کوری، لە سالی (٧٤٦)دا چووە سەر کورسی سەرۆکایەتی کە بە میرات بۆی مابۆوە. ئەم حەسەن ناوە، سیمای جوان و رەوشتی جوان بوو. پتر لە باوکی سەرقالی کاروباری مەملەکەت دەبوو. بە بیری تیژو ریوشوینی بەجی یاسانامەیەکی بۆ کاروباری لەشکرو ولات نووسییەوە، بە جۆریك کە هەریەکە لە ئەندامانی لەشکرو بەریوەبەرانی ولات، سنووری جموجولی خۆیان بزانن. لە ریزەکانی لەشکردا، کۆمەلیکی لە لاوانی مەملەکەت هەلبژارد، کە ژمارەیان پتر لە سی هەزار کەس بوو، و لە پیناوی پەروەردە کردنیاندا هەولیکی بیئەندازەی دا. بەم کۆمەلەی دەگوت (پاریزەرانی ولات) و گرنگییەکی تایبەتی پیدەدان. شەوو رۆژ ئەم سێ هەزار کەسە میوانی خوانی بەخشندەیی ئەو بوون. ئەو دوو– سێ جارەی کە لەگەل سەردارو سەرکردە لەشکرییەکانی دەولەتی عوسمانیدا جەنگا، بە هۆی ئەم ژمارە کەمە پەروەردە کراوەوە، ناوو ناوبانگیکی باشی پەیدا کردو لە هیچ یەکیك لەو جەنگانەدا، سەردارە عوسمانییەکان هیچیان چنگ نەکەوت.

لە سالی (٧٧٤ك)دا، قەلایەکی ئیجگار قایمی لەسەر کیویك کە دەکەویتە یەك فرسەخی شاری سنەی ئیستاوە، بنیاتنا. لە باکووری قەلاکەدا ئاواییەکی بەرپا کردو

قەڵاو ئاواییەکەی ناونا (حەسەن ئاوا). ئێستاش کە ساڵی (١٣٠٩)ی کۆچییە، هەمان ئاوایی لە خۆرهەڵات و پاشماوەکانی قەڵاکە، دیارن.

سیو هەشت ساڵ بەوپەڕی دەسەڵاتەوە، لە قەڵەمڕەوەکەی خۆیدا ژیاو لە (ربیع الاول)ی (٧٨٤)ی کۆچیدا، دنیای فانیی بەجێهێشت.

## باسی حکومەتی ( بابلول )ی کوڕی حەسەن لە کوردستاندا

(بابلول)ی کوڕی بەوپێیەی کە:

**جهانی نماند[٤] بەبی کدخدای یکی چون رود دیگر آید بجای**

(واتە: جیهان بێ کوێخا نامێنێتەوە کە یەکێك ڕۆیشت یەکێکی تر دێتەجێی)

لە مەملەکەتی بە میراتی ماوی باوکیدا، ئاڵای سەرۆکایەتی هەڵکرد. ئەم بابلولە کەسێکی ئازاو ڕەشید بوو، ئازایەتیەکەی گەیشتبووە ڕادەی هەڵەشەییو سەرچڵیو، حەزی لە ڕشتنی خوێنی ژێردەستانی خۆی بوو. چاوپۆشیو لێخۆش بوونی لە هەڵەی بچووك و گەورە نەبوو، بە هۆی ئەمەوە هەمیشە کاربەدەستانی وڵاتی دڵساردو دڵتەنگ دەکردو کاربەدەستانی لەشکریشی دەڕەنجاند. دوو- سێ جار ڕەعیەت دژی ڕاپەڕین، ئیبراهیم بەگ ناوێك کە وەزیری بابلول بوو، و پیاوێکی داناو زیرەك بوو، چارەسەری کێشەی یاخیبوونی دەکردو سەربەخۆیی بابلولی لە فەرمانڕەواییدا دەپاراست.، پاش چل و چوار ساڵ فەرمانڕەوایی ڕوویکردە دیاریی ئەبەدییەت.

## باسی حکومەتی ( مەنزەر- منظر )ی کوڕی بابلول لە کوردستاندا

(مەنزەر)ی کوڕی لە ساڵی ٨٠٨ی کۆچیدا پاڵیدا بە بالیفی سەرۆکایەتیەوە. بە هۆی بەخشندەیی خۆیەوە، ژەنگی بێزاریو دڵتەنگیی لە ئاوێنەی دەروونی دوورو نزیکدا سڕییەوە. ئەمیرو گەورەپیاوانی کورد بە دەست و دیاری فراوانەوە چوونە خزمەتیو پەیمانیان دایە گوێ بە فرمانی بن. ئەم مەنزەرناوە هەولێکی بێئەندازەی دا بۆ چاکردنەوەی ئەو خراپیو شکاوییانەی باوکی بەجێی هێشتبوو. پاش سیو چوار ساڵ فەرمانڕەوایی (مەئمون بەگ)ی کوڕی کردە جێنشینی خۆیو کۆچی دوایی کرد.

## باسی فەرمانڕەوایی ( مەئمون بەگ )ی کوڕی مەنزەر بەگ لە کوردستاندا

(مـەئمون بـەگ) بـە پێـی مـیراتی، لـە سـاڵی (٨٤٢)ی کۆچیـدا سـەرۆکایەتی کەوتەدەست ئەم. مەئمون بەگە، پاش سەقامگیربوونی کاروباری حکومەت، دەستیکرد بـە ئاوەدانکردنـەوەی وڵات و کۆکردنـەوەی لەشـکر. بێباکانـە پـەلاماری دەوڵـەتی عوسمـانیدا. پـاش دوو سـاڵ پێکـدادان و هـێرش و پـەلامار، دووبـارە سـنوورەکانی خۆرئاوای کوردستان، واتە (شـارباژێڕ) و (هـەولێر) و (کۆیـە) و (حـەریر) و (ئـامێدی) و (رەواندز)ی گرتەوەو، حاکم و کاربەدەستی بۆ هەموویان دانا. کۆمـەلیکی لەشـکرەکەی خۆی وەکو بنکـەی چـاودێریو پاسـەوانی لـە گونـدی رەوانـدز دانـا، بـۆ ئـەوەی لەهـەر شـوینیکی ویلایەتـەکانی قەلەمرەوەکـەیدا بـی نـەزمیو پشـیوی روویـدا، هـەولبدەن چارەسەری بکەن و کۆتایی پیبهینن. (٣٨) ساڵ بەم شیوەیە فەرمانرەوایی کردو کەس نەیتوانی دەستبخاتە ناو مەملەکەتەکەیەوە. بـە هـۆی ئازایـەتیو جوامـیریو، زیرەکـیو دانایی ئەم مەئمون بەگەوە، تایەفەی بەنی ئەردەڵان بە (مەئمونی)* ناویان دەرکرد کە لە کوردیدا (موخەففەف)ی مەئمونە.

بەهـەرحاڵ مـەئمون بـەگ پـاش (٣٨) سـاڵ فـەرمانرەوایی، هـەموو کاربەدەسـت و میرەکانی ویلایەتەکانی قەلەمرەوەکەی لە بارەگـای خۆیـدا کۆکـردەوەو، ویلایەتـەکانی قەلەمرەوەکەی لـە نیـوان سـێ کـوری خۆیدا دابەشـکرد، کـە ناویـان (یەکـە بـەگ)* و (سورخاب بەگ) و (محەمەد بەگ) بوو. ناوچەکانی (زەلم) و (نفـود)ی سـپارد بـە کـورە گەورەکـەی (یەکـە بـەگ). ناوچـەکانی (هەشـلی–هشـلی)، (پلگـان)، (سـنەی ئـەمرۆ)،

---

* لە دەقەکەدا هەردوو وشەکە وەك یەك نووسراوە، بەڵام رەنگە ئەوی یەکەمیان (مامونی) بیت.

* لە کتیبەکەی مامۆستا شوکر مستەفادا بیگە بەگ نووسراوە ح.

(قەڵەمڕەوی علی شکر)، (میهرەبان=مهربان) و (کەلاش—کلاش) کە جوانڕۆی ئەمڕۆیــە، سپاردنی بە (سورخاب بەگ). (سرۆچك)، (قــەرەداغ)، (شـاربـاژێڕ)، (ئـالان)، (هــەولێر)، (کۆیە)، (حەریر)، (ئامێدی) و (ڕەوانــدز)ی دایــە دەسـت (محەمــەد بــەگ) و ئامۆژگـاری کردن پێکەوە ڕێك و هاوکاربن. خۆیشی گۆشەگیری هــەڵبژاردو پــاش یــەك ســاڵ کۆچـی دوایــی کــرد. کوڕەکــانی، هەریەکــە لــە موڵکــی مــیراتیو دیــاریکراوی خۆیــدا بــە فەرمانڕەواییەوە خەریکبوون و، ڕێزگرتن لە (یەکە بەگ)ی برا گــەورەیان و گوێڕایــەڵیان بۆ قسەو فەرمانەکانی، بە واجیب دەزانـی. یەکـە بـەگ، ٤٢ سـاڵی تـەواو ڕۆژگـاری بـە فەرمانڕەوایيو سەرپەرشتی کردنــی براکانیــەوە بردەســەرو لــە ســاڵی (٩٤٢ك)دا بــەرەو ئاخیرەت کۆچی کرد.

## باسی حکومەتی ( مەئمون بەگی دووەم )
## لە کوردستاندا

مەئمون بەگی دووەم (کوڕی یەکە بەگ)، چووە سەر تەختی فەرمانڕەوایی و چــل و دوو ســاڵی بــە حوکمڕانــی بردەســەر. (ســولتان سـلێمان خـــان)ی ســوڵتانی دەوڵــەتی عوسمـانی[٥]، لەشـکرێکی گـەورەی بـە سـەرکردایەتی (حسـێن پاشـا) نـاوێك نــارد بـۆ داگیرکردنی ویلایەتی کوردستان. لـە دەوروبـەری شـارەزوور، مـەئمون بـە گ بـە چـوار هەزار سواری پۆشتەو پەرداخەوە ڕووبەڕووی بوویەوەو هەردوولا بە یەك گەیشتن.

ڕۆژی دوو شەممە ٨ی (ذو القعدة)ی ساڵی ٩٤٤ کۆچـی، لـە بەرەبەیانـەوە تـا کـاتی ئێوارە، ئەم کۆمەڵە کەمە لەگەڵ (٢٠) هەزار کەسی لەشکری عوسمانیدا شــەڕیان کـردو مەردانە خۆیان ڕاگرت. لە هەردوولا ژمارەیەکی زۆر کوژران. کە شەو داهــات، دەسـتیان لە شەڕو ململانێ هەڵگرت. مەئمون بــەگ لەگـەڵ پاشمـاوەی لەشـکرەکەیدا، لـە قـەڵای زەڵمدا ئابڵۆقە دراو کەوتە قایمکردن و پارێزگاری کردن لە قەڵاکە. نزیکــەی یــەك مـانگ خۆی ڕاگرت. لەشکری عوسمانی قەڵاکەیان ئابڵۆقەداو ڕێگەی هاتنــەدرەوەیان لێگرتـن.

مەئمون بەگ، تەنها لەبەر ڕزگارکردنی خەڵکی قەڵاکە، بە شەو لەگەڵ چەند کەسێك لە پیاوە تایبەت و نزیکەکانی خۆیدا، لە قەڵاکە هاتە دەرەوەو ڕوویکردە بارەگای سوڵتان سلیمان خانی سوڵتانی عوسمانی. کاتێك گەیشتە ئەستەموول، زنجیریان کردو لە زیندان توندیان کرد. کە لەشکرەکە هەواڵی ڕۆیشتنی مەئمون بەگیان بیست، ویلایەتەکانی قەڵەمڕەوەکەیان تالان کرد و گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان.

کاتێك (سورخاب بەگ)ی کوڕی مەئمون بەگی یەکەم کە مامی ئەم مەئمون بەگی دووەمەیە، بە مەسەلەکەی زانی، لە ساڵی ٩٤٥ی کۆچیدا موڵکی برازاکەی خۆی داگیرکرد. سەرباری ئەوەش، میراتە موڵکی (محەمەد بەگ)ی برا بچووکی خۆیشی داگیر کردو هەموو کوردستانی خستە ژێر دەستی خۆیەوە، دەرگای نامەگۆڕینەوەو گوێ بە فەرمانیو ملکەچکردنی لەگەڵ (شاتەهماسب)[٦]ی سەفەویدا کردەوە. لەسەر کێوێکی بەرزی ناوچەی مەریوان، قەڵایەکی پتەوی دروستکرد بۆ ئەوەی لە کاتی پێویستدا پەناگەی ئەهلی مولك بێت. ئێستاش پاشماوەکانی ئەو قەڵایە دیارن و خودی بەندە کە نووسەری ئەم نامیلکەیەم (رسالە)، چوومەتە ناو قەڵاکەوەو پاشماوە کۆنەکانیم دیوە.

بەهەرحاڵ، (محەمەد بەگ)ی برا بچووکی (سورخاب بەگ)یش، لەبەرئەوەی موڵکە میراتیەکەی لێزەوتکرا، ئەویش پەنای بردە بەر دەرباری سولتان سلێمانخانی عوسمانی. ئەم مەسەلەیە سوڵتان سلێمانخانی تووڕە کرد. مەئمون بەگی لە زیندان و بەندیخانە هێنایە دەرێو موڵکی (حللە)ی بۆ دانا، بۆ ئەوەی ببێتە سەرچاوەی بژێوی ماڵ و منداڵی. ڕۆستەم پاشای (سەرداری ئەکرەم- سردار اکرم)ی دەوڵەتی بە (٣٠) هەزار سەربازەوە، لەگەڵ مەئمون بەگ و محەمەد بەگدا نارد بۆ کوردستان و فەرمانی دانێ کوردستانی قەڵەمڕەوی سورخاب بەگ لەناوبەرن و وێرانی بکەن. لە ساڵی ٩٤٧ی کۆچیدا، ڕۆستەم پاشا بەوپەڕی لە خۆبایی بوونەوە چووە ناو شارەزوورەوە. سورخاب بەگ بە ٨ هەزار سەربازی کوردەوە ڕێگەی پێگرتن و ڕۆژی پێنج شەممە ٢٤ی مانگی (ڕەجەب)ی ساڵی ٩٤٧ی کۆچی، لە دەشتی شارەزووردا هەردوولا بەیەك گەیشتن.

لەم نەبەردەدا سوارەی کورد مەردانە جەنگان و سێ جار پەلاماردەرو پیشرەوانی لەشکری عوسمانییان لەسەر ریی خۆیان لادا، کە پتر لە (١٠) هەزار کەس بوون. لە بەیانیەوە تا ئیوارە شەرو کوشتار بەردەوام بوو. تاریکی شەو هەردوو لەشکرەکەی لیك جیاکردەوەو هەریەکەیان گەرانەوە بۆ شوینی حەسانەوەی خۆیان. سورخاب بەگ هەشت رۆژی تەواو لەگەڵ ئەم لەشکرەی عوسمانیدا شەریکرد. لەم چەند رۆژەی نەبەردەکەدا، نزیکەی (٧) هەزار کەس لە لەشکری عوسمانیو (٣) هەزار کەس لە لەشکری کوردان کوژرا. سورخاب بەگ بۆ پاراستنی پاشماوەی سوپاکەی، لە قەڵای زەلمدا پەنای گرت. سوپای عوسمانی گەمارۆی قەڵاکەیان داو کەوتنە پەلاماردانی ناوچەکانی شارەزوور. ماوەی گەمارۆکە دوو سالی تەواوی خایاندو نەیانتوانی زیان بە پاریزەرانی قەڵاکە بگەیەنن.

شا تەهماسب کە بەم رووداوەی زانی، (١٥) هەزار سەربازی بە سەرکردایەتی (حسین بەگ) ناویك، نارد بۆ یارمەتیدانی سورخاب بەگ. کاتیك (حسین بەگ) بە لەشکری شاتەهماسبەوە گەیشتە دوو فرسەخی قەڵای زەلم، سوپای عوسمانی لە بیستنی هاتنی ئەم لەشکرە سەریان لیشیواو سەرگەردان بوون. بە ریکەوت (صدفە) و قەدەر رۆستەم پاشای سەرداری عوسمانی بە بیستنی ئەم هەواله، بە مەرگیکی کتوپر گیانی لە دەستدا. ئەم مەسەلەیە ئەوەندەی تر سەری لە سوپای عوسمانی شیواند. سورخاب بەگ کە مردنی فەرماندەی عوسمانی و هاتنی لەشکری هەمیشە سەرکەوتووی شەهریاری عەجەمی بۆ یاریدەدانی خۆی بیست، لەگەڵ هەموو لەشکرو نزیکەکانی خۆیدا لە قەڵاکە هاتنە دەرێو حسین بەگی سەرداری سوپای ئیرانیان لە رووداوەکان ئاگادار کردەوە. حسین بەگ زۆر بە پەلە روویکردە مەیدانی نەبەرد. سوپای عوسمانی بۆ ماوەیەك زەرەریان دا، بەڵام سەرەنجام زەرەریان دی. بۆ جەنگ هاتبوون، بە نەنگەوە گەرانەوە. هەندیکیان رایانکردو هەندیك خۆیان دا بە دەستەوە. هەندیك لە هەڵاتندا پەلەیانکردو گەلیکیش لە پیك هەلپژاندا کوژران، (محەمەد پاشا)

ناویك لەگەڵ (٦٠٠) کەسی سوپای عوسمانیدا، پەنای بردە بەر قەڵای زەلم کە پیاوی جەنگاوەری تیدا نەبوو، و ژن و مندالی سورخاب بەگی کردە تکاکار بۆ رزگاربوونی خۆی. حسین بەگی سەرداری سوپای ئیران، تکای ژنانی قبولکرد، محەمەد پاشای لەگەل ئەو کۆمەلە کەسەی لەگەلیدا بوون، بەرداو رەوانەی دەولەتی عوسمانی کردنەوە. حسین بەگ و سوپای ئیران بەوپەری شانازیو ریزەوە گەرانەوە بۆ دەرباری شاو سورخاب بەگیش بەوپەری هیزو دەسەلاتەوە لەسەر کورسی سەرۆکایەتی ویلایەتی کوردستان جیگیر بوو. ماوەیەك بەسەر ئەم رووداوانەدا، سورخاب بەگ لە قەلای زەلمەوە گواستیەوە بۆ قەلای مەریوان و ئەویی کرد بە پایتەخت و شوینی بەریوەبردنی کاروباری کوردستان.

له سالی (٩٥٦)دا، (ئەلقاس میرزا)(٧)ی برای شاتەهماسب کە ماوەیەکی زۆر بوو لە دەولەتی شاتەهماسب هەلگەرابۆوە، هاتە دەوروبەری شارەزوور. کوردەکانی ئەو ولاتە. کەوتنە دژایەتی کردنی. لە لایەن شاتەهماتسبیشەوە، بەهرام میرزا (برای شاتەهماسب و ئەلقاس میرزا- وەرگیر) و (شاقولی خەلیفە- شاهقلی خلیفە)ی مۆردار لەگەڵ ئیبراهیم خان و (٢٠) هەزار سواردا پەلاماریان دا. لە سنووری شارەزوورو مەریواندا بلاوەیان بە هیزەکەی کردو شکاندیان. ئەلقاس میرزا لە نیوان هەردوو دەولەتی عوسمانی و ئیراندا خۆی لە بەردەم هەرەشەی لەناوچووندا دیو سەرلیشیواوو سەرگەردان روویکردە قەلای مەریوان و پەنای بردە بەر سورخاب بەگی والی کوردستان. سورخاب بەگ لە حوزووری شاتەهماسبدا بووە تکاکاری گوناهەکانیو بە هۆی ناوبژیکردنی (نیعمەتوللای قەهقانی-نعمة الله قهقانی)یەوە، کە جێ متمانەی شاتەهماسب بوو، ئەلقاس میرزای لەگەڵ بیست و یەك کەس لە پیاوەکانی خۆیدا ناردە حوزووری شاتەهماسب. شاتەهماسب لە پاداشتی ئەم خزمەتەدا، مەرحەمەتی شایان و نەوازشی بیپایانی بەرامبەر سورخاب بەگ نواندو سالانە بری یەك هەزار تمەنی لە خەزینەی دەولەتی ئیران و بە شیوەیەکی بەردەوام، بۆ برییەوە.

سورخاب بەگ (١١) كوری هەبوو. یەكەم حەسەن بـەگ، دووەم ئەسـكەندەر بـەگ، سییەم سولتانعەلی بەگ، چوارەم یەعقوب بەگ، پینجەم (بارام—بەهرام) بەگ، شەشــەم زولفەقار بەگ، حەوتەم (ئالش—آلش) بـەگ، هەشـتەم شاسـوار بـەگ، نۆیـەم سـاروخان بەگ، دەیەم قاسم بەگ و یانزەیەم (بەسات—بساط) بەگ. سورخاب بـەگ (سـولتانعەلی بەگ)ی كوری سییەمی كردە جینشینی خۆی، كە بـە مەردایـەتیو ئازایـەتی لـەوانی تـر جیادەكرایەوە. بارام بەگی كوری پینجەمیشی كردە فـەرمانرەوا لـە رەوانـدزو ئـامیدی. بە جۆریك كە تا سالی (١٢٤٠)ی كۆچی كورو كورەزاكانی ئەم بارام بەگە، لـەو مولكـەدا حوكمران و فەرمانرەوا بوون. ئەو (محەمەد) ناوەی بە مـیری رەوانـدز بـەناوبانگ بـوو و سـالەهای سـالْ لەگـەل دەولـەتی عوسمـانیدا شـەرو كیشـەی هـەبوو، یـە كیـك بـوو لـە نەوەكانی ئەم بارام بەگە.

بەهەرحالْ، سورخاب بەگ پاش (٣٠) سالی تـەواو كۆچـی دوایـی كـرد. زۆری نـەبرد سولتانعەلی بەگیش كە جینشینی ئـەو بـوو، كۆچـی دوایـی كـردو دوو مندالـی لـە پـاش بەجیما. یەكیكیان تەیمور خـان و ئـەوی تریـان هـەلۆخان. لـە سـالی (٩٧٥)ی كۆچیـدا (بەسـات—بسـاط) بـەگی كـوری سـورخاب بـەگ، پیــی نایــە ســەر (بــەرە—بســاط)ی سەرۆكایەتی.

## باسی حكومەتی ( بەسات بەگ )ی كوری سورخاب بەگ لە قەلەمرەوی باوكیدا

ئەم بەسات بەگە پیـاویكی چاكـەكارو دانـاو زانـا بـوو. بەوپـەری توانـاوە هـەولی دا زانستە ئایینیو ئەدەبیەكان بلاوبكاتەوەو نزیكەی (١٠) سـالی بـەو شـیوەیە بردەسـەر. لـە سـالی ٩٨٥ی كۆچیـدا، تـەیمورخان و هـەلۆخانی كـوری سـولتان عـەلی بـەگ، لیــی راپەرین و پــەنایان بـردە بـەر دەربـاری شـا ئیسـماعیلی دووەم[٨]. بـۆ مـاوەی نزیكـەی سالیك لە (دار السلطنة)ی تەوریزدا بە سەرگەدانی دەژیان، تـا لـە سـالی (٩٨٦)دا، شـا

ئیسماعیل کۆچی دوایی کرد. تەیمورخان و هەلۆخان گەرانەوە بۆ ویلایەتی کوردستان، کۆمەلیکیان لە خۆیان کۆکردەوەو دەستیاندایە پەلاماردانی قەلەمرەوی بەسات بەگ. بە قەزاو قەدەری ئاسمانی، بەسات بەگیش لەم سالەدا کۆچی دوایی کرد. تەیمورخانی کوری سولتان عەلی بەگ لە جیی مامی خۆی چووە سەر کورسی فەرمانرەوایی.

## باسی فەرمانرەوایی ( تەیمورخان )ی کوری سولتان عەلی بەگ لە جیگەی مامی لە کوردستاندا

لەبەرئەوەی لەم سالەدا (کە ٩٨٦ی کۆچی بوو)، هیشتا سولتانیکی بەهیز لەسەر تەختی سەلتەنەتی ئیران جیگیر نەبووبوو، تەیمور خان بە پیی پیویستی ئەو رۆژگارەو خۆگونجاندن لەگەڵ زەمانەدا، ملکەچیو گوی بە فەرمانیی خۆی بە سولتان موراد خانی سولتانی عوسمانی[٩] راگەیاند. سولتان موردخان ئەم مەسەلەیەی پیخۆش دەبێ، بری (١٠٠) هەزار (ئاغچە زیر) وەکو مووچەی بەردەوام بۆ تەیمورخان دەبریتەوە، کە نزیکەی ٣٠ هەزار تمەن پارەی ئیستای ئیران دەکات.

تەیمورخان چوار کوری هەبوو. سولتان عەلی بەگ، بوداق بەگ، موراد بەگ و (میر عەلەمەددین– میر علم الدین). ویلایەتەکانی ژیردەستی خۆی بەسەر ئەم چوار کورەدا دابەشکرد. (شارەزوور) و (قزلجە)و (حەسەن ئاوا– حسن آباد) و (زەلم)ی دا بە سولتان عەلی بەگ. (شارباژیر) و (قەرەداغ) و (کۆیە) و (حەریر)ی بە بوداق بەگ سپارد. (مەریوان) و (سەقز) و (سیاکۆ– سیاه کوه) و (تیلەکۆ) و (خورخورە)ی دا بە موراد بەگ و (شارباژیر)ی دایە دەست میر عەلەمەددین[١٠]. خۆیشی (واتە تەیمورخان) بە سوپایەکی گەورەوە کەوتە گرتنی ناوچەکانی گۆشەو کەناری کوردستان. کرماشان و (سونقور–سنقر) و (زەرین کەمەر– کە ئیستا بە گەروس بەناوبانگە) و (دینەوەر)ی گرت و، ئالای سەربەخۆیی هەلکرد.

له ٩٩٣ی کۆچیدا هیرشی کرده سـەر قەلـەمرەوی (عومـەر بـەگی کـەلهور). عومـەر بەگ بە ناچاری پەنای بردە بەر (شاویردی خان)ی والی لورسـتان. شـاویردیخان لەگـەڵ خەلکی لورستان و سوپای کەلهوردا، ریگەی بە تەیمورخان گرت، لە کاتیکدا کە بە هیچ جۆریك چاوەریی دوژمنیکی ئاوا نـەبوو. تـەیمورخان بـە سـوپا بچووکەکەیـەوە، کـە لـە هەزار سوار کەمتر بوون بیباکانە لەگـەڵ سـوپای کـەلهورو لورسـتاندا کەوتـە شـەرەوە. لەبەرئەوەی سـەرکەوتن و بردنـەوە بەدەسـت تـەقدیری خـودای دادگـەرە، لـە مـەیدانی نەبـەرددا ئەسـپی تـەیمورخان گـلاو ئـەو ئاسمـانی ئازایەتیـەی دابـە زەویـدا. سـوپای لورسـتان پـەلاماریان داو دیلیـان کـرد. شـاویردیخانی والی لورسـتان بەوپـەری ریـزو ئەدەبەوە تەیمورخانی بردەوە مالی خۆیو هەرچەندە کە دیل بوو، وەکـو مـیریك ریـزی لیگـرت. لـە رووی دووربینییـەوە پـاش چـەند رۆژیـك بـە ریـزەوە رەوانـەی کوردسـتانی کردەوە.

تەیمورخان پاش سێ ساڵ چوو بـۆ تـەمیکردنی خـەلکی زەریـن کەمـەری گـەروس. (دەولەتیار سولتانی سپامەنسوری)[11] کە ئەوکاتە حاکمی زەرین کەمـەر بـوو، بـە سـێ هـەزار کەسـەوە رووبـەرووی تـەیمورخان بـووەوە. پـاش شـەرو ململانییـەکی کـەم، دەولەتیار سولتان شکاو لەناو قەلاَی زەرین کەمـەردا گـەمارۆدرا. تـەیمورخان هـەر بـەو ژمارە کەمەوە کە لەگەلیدا بوون بریاری دا قەلاَکە بگریت. پاش کردنەوەی قەلاَو هیرش بردنی بۆ ناوەوەی، تیریك تەیمور خانی پیکاو کوشتی. سەرەرای کوژرانـی سـەرداریکی ئاوا، هیشتا لەشکرەکەی بەوپەری ئازایەتیو بیباکییەوە دەستیاندایە تۆلە سـەندنەوە، دەولەتیار سولتان و پتر لە (٢٠٠) کەسی خەلکی زەرین کەمەریان کوشت و تـەرو وشـك هـەرچییان بەردەسـت کـەوت تالاَنیـان کـرد. هـەر لـەوێ لاشـەی تـەیمورخانیان بە خاك سپارد.

خەلکی مەملەکەت (ئەهلی مولك) حەزیان دەکرد (هەلۆخان)ی برای تەیمورخان کـە پیاویکی زانا بوو، ببیتە سەرۆکیان.

## باسی حکومەتی ( هەلۆخان )ی برای تەیمورخان و ملکەچکردنی بۆ شاعەباس

لە سالی ۹۹٦ی کۆچیدا دەستی بەسەر قەلەمرەوی تەیمورخاندا گرت و بە سەربەخۆیی بووە فەرمانرەوا. ئەم هەلۆخانە، بە ملکەچکردن و گوێ بە فرمانی، ماوەی دوو سالی لەگەڵ (سولتان سلیمان)ی سولتانی عوسمانیو پاشای ئیراندا بەسەربرد. لەم ماوەیەدا، (پایتەخت–دار الملك)ی کوردستانی لە قەڵای زەلم و قەڵای مەریوانەوە گۆڕیو هینای بۆ قەڵای پلنگان. ئەم قەڵای پلنگانە دەکەوتە شوینیکی ئیجگار سەخت و عاسییەوەو یەکیك بوو لە قەڵا قایمەکانی جیهان لەوکاتەدا. هیچ یەکیك لە سولتانەکانی جیهان نەیانتوانی بە زۆر داگیری کەن. خیلی کوردانی کەلهور کە یەکیکن لە خیلە ناودارەکانی کورد، لەوێ نشیتەجێ بوون. هەلۆخان گەلیك ئاوایی بنیاتنا، قەڵاکەی قایمتر کردو چەندین بازارو مزگەوتی لەوپەری پتەویدا دروستکرد. ئەم قەڵای پلنگانە دەکەویتە دوانزە فرسەخیی شاری سنەی ئیستاوە. هەروەها (هەلۆخان) دەستیکی تەواوی بە قەڵای زەلم و مەریوان و حەسەن ئاوادا هیناو، هەرسی قەڵاکەی لەوپەری شکۆو پتەویدا ئاوەدان کردەوە.

ئەم هەلۆخانە، پیاویکی دلیرو ئازادو دادگەر بوو. لەگەڵ رەعیەت و ژیردەستاندا بە یاسای دادو مەردایەتی دەجووڵایەوەو لەگەڵ میرو فەرمانرەوایانی نزیك و هاوسیی کوردستاندا بە میهرەبانیو دۆستانە رەفتاری دەکرد. بە هۆی ئەمەشەوە، ویلایەتەکانی قەلەمرەوەکەی تا دوا پلە ئاوەدان بوو، و خەزینەکەی پربوو لە زیرو زەر. لە ماوەی جیاجیای سالدا لەم چوار قەڵایەدا دەمایەوە. ئامادەییو زۆربوونی ژمارەی سوپاکەی گەیشتە رادەیەك کە داواو لافی فەرمانرەوایی سەربەخۆی لیدەدا، قەلەمرەوەکەی خۆی بە دەولەتی سەربەخۆ ناودەبردو گوێ بە فەرمانی هیچ پاشایەك نەبوو.

له سالی (١٠١٢)ی کۆچیدا[١٢] (حسین خان)ی حاکمی لورستان به فیتی شاعەباسی (ماضی) پاشای ئیران[١٣]، به نیازی شـەر لەگـەڵ هـەلۆخاندا، بـه (١٠) هـەزار کەسـەوە پـەلاماری کوردسـتانی داو گـەمارۆی قـەڵای (حەسـەن ئـاوا–حسـن آبـاد)ی دا، کـه لـەو کاتـەدا هـەلۆخان ماوەیـەك بـوو وەکـو گەرمیانـه هـــەوار لیـــی دابـــەزیبوو. هەرچـــەندە لەوکاتەدا ژمارەیەکی کەم لەناو قەڵاکەو لەگەڵ هـەلۆخاندا بـوون، بـەڵام (حسـین خـان) هیچی پینەکراو له سێ– چوار مـەیداناو لـه هـەموو شـوینیك تیکشـکا. سـەرەنجام لـه مەیدانی نەبەرددا زۆر خراپ تیکشـکاو هـەڵات. لەشـکری هـەلۆخان چـوار فرسـەخ دوای کەوتن و نزیکەی هەزار کەسیان له لەشکری لورسـتان کوشـت. شـاعەباس کـه ئەوکاتـه خـاوەنی سـەلتەنەتی ئـیران بـوو، لـه جموجولـه سـەربەخۆکانی هـەلۆخان رەنجـاو سوپایەکی نارد بۆ ئەوەی هەلۆخان له کۆڵ بکاتەوە. سوپاکه بیئەوەی به مەرام بگـات گەرایەوە. بۆ جاری دووەم هەمان کار به لەشکریکی ئامـادەتر لـەوی پیشـوو سـپیردرا، لەسەر سنووری کوردستان هەلۆخان تیکیشکاندو هەڵاتن. سییەم جار شاعەباس خـۆی به لەشکریکی گەورەو فراوانـەوە، بـه مەبەسـتی داگـیرکردنی کوردسـتان و تـەمیکردنی هەلۆخان، کەوتەرێو گەیشته (ئسـفەند ئابـاد– اسـفند آبـاد)ی کوردسـتان، کـه ناویـان ناوە قەلەمرەوی (علـی شـکر). (ئـالی بـالی) نـاویکی (زەنگەنـه) کـه خزمـەتکارو پیـاوی تایبەتی شاعەباس بوو، پاشای لەم سـەفەرو شـەرە پەشـیمان کـردەوەو گەرایـەوە بـۆ بارەگای سەلتەنەتی خۆی. پاش ئەم رووداوانه، شاعەباس ریگـەی نـەرمیو میـهرەبانی لەگـەڵ هـەلۆخاندا گرتەبـەرو بـه هـۆی هـەمان ئـەو (ئـالی بـالی) نـاوەوە، بـۆ رینمـایی‌و راکیشانی، فەرمان و (بەرگ–خلعت)یکی[١٤] نارد بۆ ئەوەی هـەلۆخان بترسـێو ملکـەچ بکات. ئینجا (هـەلۆخان)، (خـان ئەحمـەد خـان)ی کـورە گـەورەی خـۆی بـه دەسـت و دیاری شایانەوە نارد بۆ دەرباری پاشا. پاش گەیشتنی، له هەموو روویەکەوە دلنـەوایی کـرا. شاعەباسـی (مـاضی) بـه پیـی بـەرژەوەندی دەولـەت (کـڵاوزەر–زریـن کـلاه)ی خوشـکی خـۆی کـردە هاوسـەری خـان ئەحمـەد خـان و پـەیمانی لیوەرگـرت کـه لـه

گەرانەوەیدا بۆ **کوردستان**، هەلۆخانی باوکی بنیریت بۆ دەرباری شا. خـان ئەحمـەد خانیش پاش هاتنەوەی بۆ کوردستان، پەیمانەکەی بەجیگەیاندو پـاش چـەندین جـۆرە ئامادەکـاریو ریخۆشـکردن، هـەلۆخانی نـارد بـۆ ئەسـفەهان. پـاش ئـەوەی هـەلۆخان گەیشتە ئەسفەهان، شـاعەباس ریـزو میـهرەبانی پیویسـتی بەرامبـەر نوانـد. هـەلۆخان دوای شەش مانگ مانەوە لە ئەسفەهان روخسەتی گەرانەوە بۆ کوردستانی دەسکەوت. بە پیی داواو تکای خودی هەلۆخان، فەرمانی حکومرانی بەسەر هەموو کوردستاندا، لـە هەمەدانەوە تا (ئەمانییە) و کۆیەو حەریر، بە ناوی خـان ئەحمـەد خانـەوە دەرچـوو، و خان ئەحمەد خان لە سالی ١٠١٤ی کۆچیدا حکومەتی کوردستانی کەوتە دەست.

## باسی حوکمرانی ( خان ئەحمەد خان )ی کوری هەلۆخان لە کوردستانداو

## لەشکرکیشییەکانی خان ئەحمەد خان

لـەو سـالەدا خـان ئەحمـەدخان ئـالای ئـەمارەت و سـەرۆکایەتی هـەلکردو کەوتـە تـەیارکردنی لەشـکرو سـوپا. بـە پیـی فـەرمانی پاشـا، (٢٠) هـەزار سـوارو پیـادەی ئامادەکرد بۆ تەمیکردنی خەلکی موکریو بلباس. هەرچـەندە خـەلکی موکـریو بلبـاس کۆمەلیکی بێ شومارو بێ سـنووریان ئامـادە کـردو بـە نیـازی نەبـەرد هاتنـە پیشـەوە، بەلام کاتیك هەردوولا بەیەك گەیشتن، دلیرانی کوردستان بیباکانە پەلاماریان دان. پاش شـەرو ململانییـەکی کـەم، لەشـکری موکـریو بلبـاس شـکان. کۆمـەلیکیان لی کـوژراو گەلیکیشیان دەسگیرو دیلکـران. ئـەو ژمـارە کەمـەی کـە گیـانی خۆیـان لـە شمشـیری دلاوەرانی کوردستان قوتار کرد، پەنایان بردە بەر قەلای رەواندزو خەلکی ئەوێ. خـان ئەحمەد خان دوایـان دەکـەوێ، دەگاتـە قـەلای نـاوبراوو گـەمارۆی دەدات و، پـەلاماری دەوروبەرەکەی دەدات و تالانی دەکات. ریگەی هاتوچۆ لە خەلکی ناو قەلاکە دەگریـت،

بەلکو لە برسیتیدا زۆریان بۆ بێو لە ترسی شمشیرەکەی، خۆیان بدەن بە دەستەوە. ماوەیەك بەو شیوەیە تیپەری، تا خان ئەحمەد خان لە دریژەکیشانی سەفەرەکەی بیزار بوو. رۆژیك لەگەل ژمارەیەك لە پیاوەکانی خۆیدا، بۆ سەیران و راو دەچیتە کەناری ئەو دەریایەی[١٥] دەکەوتە تەنیشت قەلاکەوە. بە ریکەوت، لە کەناری دەریاکە تووشی ژنیکی ئەو خیلە دەبیت (دەبێ مەبەستی خیلی ناو قەلاکە بیت– وەرگیر). زەعیفەکە (ژنەکە) لە خان ئەحمەد حان دەپرسێ بۆچی تا ئیستا ئەم قەلایەتان نەگرتووە؟ خان ئەحمەد خان دەلیت ریرەوی قەلاکە دیارنیەو ریگای چوونە ژوورەوەشی نیە. ژنەکە لە رووی گالتەبازییەوە دەست بۆ ناوگەلی خۆی دەبات و دەلیت ئەمەش ریگای چوونە ژوورەوەی نەبوو، بەلام مەردانی مەیدان هیمەتیان بۆ کردو بە شمشیری بی کیلان، کردیان بە جادەیەکی تەخت. لەم تانەیە، رەگی پیاوەتیی ئەحمەد خان هاتە جۆش و سەربازەکانی خۆی خرۆشاند. بیباکانە هیرشی کردە سەر قەلاکە. خەلکی قەلاکە دەستیاندایە شەرکردن. (بەلام) لەبەرئەوەی بەخت یاوەری خان ئەحمەد خان بوو، بەرگەیان نەگرت و سەربازەکانی خان ئەحمەد خان چوونە ناو قەلاکەوە. پاش کوشتن و برینیکی زۆر، خەلکی قەلا داوای (ئەمان)یان کردو خان ئەحمەد خانیش ئەمانی دانێ. (حەسەن بەگ)ی ئامۆزای خۆی لەوێ بە حاکم دانا، (خالید بەگ)ی کردە حاکمی (خۆشنان)[١٦]، (ئامیدی)ی سپارد بە (عوسمان بەگ) و حاکمی بۆ کۆیەو حەریریش دیاریکرد. لەویشەوە، بە مەبەستی گرتنی موسل کەوتەرێ. کە گەیشتە ٦ فرسەخیی موسلّ، حاکمی ئەوێ لە ترسی گیانی خۆی روویکردە دیاربەکرو حەلەب. خان ئەحمەد خان بێ شەرو شۆر ویلایەتی موسلی گرت. کاربەدەست و گەورەکانی موسلّ بەدەست و دیاری شایانەوە هاتنە حوزوری. خان ئەحمەد خانیش هەریەکەیانی بە ئەندازەی پلەو پایەی خۆی نەوازش کردو زیارەتی حەزرەتی (یونس)ی بوو بە نسیب (علی نبینا و علیه السلام). چل رۆژ بۆ حەسانەوەی سەربازەکانی لە موسلّ مایەوە. مژدەی ئەم سەرکەوتنە دیارو گەورەیەی بۆ شاعەباس

نارد. شاعەباس–یش جلوبەرگ و خەنجەری رازاوە بە گەوهەرو ئەسپی تایبەت بە زینــی (مینا–عاج)ەوەو دوانزە هەزار تمەن زیری نارد بۆ خان ئەحمەد خان و پیی گوت دەبـێ کەرکوك و بەغداش بخاتە ژیر دەسەلاتی خۆیەوە.

خان ئەحمەد خان بە یاریدەی یەزدانی بەخشندە، بـەرەو کـەرکوك کەوتـەرێو ئـەو ناوچەیەی خســتە ژیـر دەسـتی خۆیـەوە. لەویشـەوە روویکـردە بـەغدا. کـە شـاعەباس هەوالی رۆیشتنی خان ئەحمەد خانی بەرەو بەغدا بیســت، بـە سـوپایەکی گـەورەوە بـە پەلە روویکردە ئەوێ. لەولاوە خان ئەحمــەد خـان گەیشـتە دەوروبـەری بـەغدا. پاشـاو گەورەپیاوانی بەغدا بە ریزەوە پیشوازییان لیکردو بە دەستودیاری شایانەوە هـاتن بـۆ لای. شاعەباس–یش گەیشتە دەوروبەری بەغدا. خان ئەحمەد خان لەگەڵ کۆمــەلیك لـە خەلکی بەغدادا چوونە پیشوازی و بەر مەرحەمەت کەوتن.

بەهەرحاڵ، پاش ریکوپیك کردنی (تەنزیم کردنی) ئەو مولکە بـەدیاریکردن و دانـانی والی بـۆ ئـەو ویلایەتـە، خـان ئەحمـەد خـان لـە سـالی (١٠٣٥)ی کۆچیدا گەرایـەوە بـۆ کوردستان. ماوەی سەفەرەکەی خان ئەحمەد خان، لە بەریکەوتنیەوە تــا گەرانـەوەی، (٧) سال و (٣) مانگ بوو.

پـاش (٣) سـاڵ شاعەباسـی (مـاضی)، پاشـای ئــیران، کۆچــی دوایــی کـرد. لــە (جمادی الاخر)ی ١٠٣٨ی کۆچیدا، (شاسەفی– شاه صفی) لە جیگەی ئەو چووە ســەر کورسی سەلتەنەت و بەریورەسمی جۆراوجۆر دلنەوایی خان ئەحمەد خانی دەکرد.

خان ئەحمەد خان کوریکی لە (کلاوزەر– زرین کلاە)ی خوشکی شـاعەباس هـەبوو، ناوی (سورخاب بـەگ) بـوو. لـە سـەرەتای لاوییـەوە، شاعەباس بردبوویـە لای خـۆیو پـەروەردەی کردبـوو. ئـە و سـورخاب بەگـە بیئـەندازە چـاك و بەخشـندەو ئــازا بــوو. نەیارەکانی شاسەفی، دلی (شاسەفی)یان لە سورخاب بەگ کرمێ کردو بیلبیلەی چاوی ئەو جوامیرەیان دەرهینا. خان ئەحمەد خان بە بیستنی ئەم هەوالە سامهینەرە عـەقلی لە دەستداو شیت بوو. میرە کوردەکان بیئەوەی کەس پیی بزانیت، ئەو شیری بیشــەی

مەردایەتیــەیان زنجــیر کــردو بــەناوی ئــەوەوە، ویلایــەتیان ریکوپیــك و بونیــادی سەرۆکایەتییان پتەو کرد. پاش ٦ مانگ حەکیم بە یەکجاری بریـاری چاکبوونـەوەی داو تەندروستییەکەی جارانی بۆ گەرایەوە. (خان ئەحمەد خـان) لـە دەوروبـەرو ئـەملاولاوە سوپایەکی زەبەندەی کۆکردەوەو پەلاماری ویلایەتە هاوسێ و نزیکەکانی دا. کرماشـان و هەمەدان و (خــوی) و (ئـەردەبیل)یشـی خسـتە سـەر قەلەمرەوەکـەی خـۆی. سـەری مینبەرەکان و دوعا خویندنی بە ناوی خۆی رازانـدەوەو بـە ئاشـکرا داوای سـەربەخۆیی کرد، لە ژیریشەوە پەیوەندی بە سولتانی عوسمانییــەوە کـردو پـەیمانی خزمـەتگوزاری دایـە. لـە لایـەن سـولتانی عوسمانییـەوە جلوبـەرگی گرانبــەهاو دیـاری جۆراوجــۆری پیبەخشرا. بە فەرمانی سولتانی عوسمانی فــەرمانرەوایی موسـڵ و کـەرکوکی پـی بـرا. خان ئەحمەد خان شاری موسلی کردە (پایتەخت–دار الملك)ی خۆی و ٧ ساڵ موســڵ و کەرکوك و سلیمانیو شارەزوور لەژیر دەستی ئەو خاوەن دەســەڵاتەدا بـوون. مـاوەی حوکمرانی خان ئەحمەد خان لە کوردستاندا (٢٦) ساڵ بوو. دواتــر باسـی سـەرەنجامی کاری خان ئەحمەد خان دەنووسینەوەو باسی دەکەین.

## باسی حوکمرانی ( سلیمان خان ) و دروستکردنی شاری سنە بە هەوڵ و کۆششی ئەو

کە هەوالی رۆیشتن و پەنابردنی خان ئەحمەد خان بۆ دەولـەتی عوسمـانی گەیشـتە شاسەفی، (سلیمان خان)ی کوری (میر عەلەمەددین تەیمور خانی ئەردەڵان)ی نـارد بـۆ ویلایەتی کوردستان و ناوچەکانی سەر بەو ویلایەتە. سلیمان خان ئەوکاتــە یـەکیك بـوو لە خزمەتکارەکانی شاسەفی و جێ متمانەی ئەو پاشایە.

لـە سـالێ (١٠٤٠)ی کۆچیـدا، سـلیمان خـان چـوو بـۆ کوردســتان و لــە کاروبــاری حکومەتدا سەربەخۆیی تەواوی وەرگرت. پاش سالیك، واتە لـە سـالی ١٠٤١ی کۆچیـدا، سولتان موراد خانی چوارەم، کە پاش عوسمان خانی دووەم بوو بوو بە سـولتانی رۆم،

خەسرەو پاشای (سەر عەسکەر)ی بە سوپایەکی بێ سنوورەوە نارد بۆ گرتنی عـیراقی عەرەب و کوردستان.

خەسرەو پاشا گرتنی کوردستانی بە لـە پیشـتر زانـی و روویکـردە شـارەزوور. (٦) فـەوجی پیـادەی لەگـەڵ (٤) هـەزار سـواردا نـارد بـۆ گرتنـــی مـــەریوان و کوردســـتان. شاسـەفی (زەینـەل خـان)ی سوپاسـالاری (شـاملون)ی بـە سـوپایەکی بـێ سـنوورەوە رەوانەی کوردستان کرد. خۆیشی بە لەشکریکی ریکوپیك و پۆشـتەو پەرداخـەوە چـوو بۆ هەمەدان. زەینەل خان زۆر بە پەلە سوپاکەی گەیاندە مەریوان.

کە خەسرەو پاشـا هـەوالی هـاتنی سـوپای ئـیرانی بـۆ یارمـەتیدانی خـەلکی ئـیران بیست، خۆیشی لەگەڵ سوپاکەیدا روویکردە ئەوێ. لە دەشتی مەریواندا هەردولا بەیەك گەیشتن و نەبەردیکی ســەخت و بـەردەوام روویـدا. پـاش شـەرو ململانـێ، زەینـەلخانی سوپاسالار تیکشــکاو هـەلات. کـە لەشـکری شـکاو گەیشـتە هەمـەدان، شاسـەفی بـۆی دەرکـەوت کـە زەینـەلخانی سـەردار لـەو نەبـەردەدا بـە وریــاییو دووربینـــی رەفتـــاری نـەکردووە، فـەرمانی کوشـتنی دراو پارچـە پارچـەیان کـرد. لـەولاوە خەســـرەو پاشـــا بیئەوەی هیچ کۆسپیکی لەبەردەمدا بیت هات بۆ سنەو بـەرەو هەمـەدان کەوتـەرێ. بـە فـەرمانی شاسـەفی، خـەلکی قەلـەمرەوی (علـی شــکر) کــە دەکەوتنــە ســەر ریگــای عەسـکەری رۆم، کۆچیـان پیکـرا. خەسـرەو پاشـا هـات بـۆ (دەرگــەزین)[١٧] و دوو رۆژ مایەوە. شاسەفی لەگەل لەشکری ئیراندا کەوتە جوولە، خەسـرەو پاشـا بـی دواکـەوتن روویکردە بەغدا.

بەهـەرحاڵ پـاش تـەواوکردنی کـاری خەسـرەو پاشـاو شــکاندنی ســوپای رۆمــی، شاسـەفی سـوپایەکی ریکوپیکـی پرچـەکی بـەرەو شـارەزوورو ناوچـەکانی کوردســـتان رەوانە کردو دووبارە گرتنەوەی ئەو ناوچانەی پی سپارد، پاش ئــەم رووداوە شاســەفی گرنگــی دا بـــە بـــە هـــیزکردنی ســلیمان خـــانی ئـــەردەلان لـــە کاروبـــاری حوکمرانـــی کوردستانداو، بیئەندازە بالادەستی کرد. سلیمان خان لە دەرباری شادا پـەیمانی دابـوو

پایتەختی کوردستان بگویزیتەوەو بیهینیت بۆ سنەی ئیستا. ئەم سنەیە لە بنەرەتدا گوندیك بووە لە گوندەکانی کوردستان و بە (سنیە) بەناوبانگ بووە. بە مروری زە مان (سنیە) بووە بە سنەو کە قەڵاکەشیان بە دەوریدا دروستکرووە پیی گوتراوە سنەدژ. چونکە (دژ) لە فارسی کۆندا مانای قەڵایە، واتە قەڵای سنە، عەرەبیەکەیشی بووە بە (سەنەندەج– سنندج). بەهەرحاڵ (سلیمان خان) بە پیی پەیمانەکەی خۆی لە سالی ١٠٤٦ی کۆچیدا ئاوەدانی کردەوە. لەسەر ئەو گردەی کە دەکەویتە ناوەراستی شارەوە، قەڵای حوکمرانیی لەوپەری پتەویدا دروستکرد، کە ئیستا هەر هەمان قەڵا، (دار الایالە)ی کوردستانە. لە دەرەوەو لە دەوروبەری قەڵای حکومەت، بناغەی بیناو حەمام و مزگەوت و بازاریکیشی داناو تەواوی کردن. لە دەشتی (سەرتودە)شدا، کە دەکەویتە خۆرئاوای سنەوە، زنجیرەیەك کاریزی هەلکەندو بە سێ قۆناغ ئاوی گەیاندە ناو قەڵای حوکمرانی. بەهەرحاڵ، سلیمان خان قەڵای زەلم و پلنگان و مەریوان و حەسەن ئاوای ویرانکرد، بۆ ئەوەی جاریکی تر حاکمەکانی کوردستان لە کاتی پیویستیدا روویان تینەکەن و نەیانکەنە پەناگا.

بۆ جاری دووەم، ئەحمەد خان دیسان بە مەبەستی گرتنی کوردستان، بە (١٢) هەزار سواری پر چەکەوە لە دەربەندی (چغان) تیپەری‌و هاتە ناوەوە. بە فەرمانی شاسەفی (عەلی بالی بە گ)ی زەنگەنەی (میر ئاخور باشی)[١٨] لەگەڵ (٣٠٠) کەسی سوارەدا، کرایە بەرپرسیاری پاسەوانی کردن لە قەڵای کوردستان. بەرگری‌و بەرەنگاربوونەوەی خان ئەحمەد خانیش بە (سیاوش بەگی قلر ئاغاسی) و (شاویردیخان)ی حاکمی کوردستان و (ئاغا خانی موقەدەم جوانشیری) سپیردرا. لە دەشتی مەریواندا هەردوولا بەیەك گەیشتن. پاش ریکخستنی ریزەکان و پیکدادانی شمشیرەکان، کۆمەلیك لەو پاشا عوسمانیانەی لە سوپاکەی خان ئەحمەد خانی ئەردەڵاندا بوون، کوژران. خان ئەحمەد خان کە لاوازی سوپاکەی خۆی بینی، ئیوارەی ئەو رۆژە دووبارە بەرەو موسڵ گەرایەوەو، پاش (٦) مانگ لە سالی (١٠٤٨)ی کۆچیدا،

لە موسڵ کۆچی دوایــی کـرد. ئـەمیرەکانی کوردسـتان تەرمەکـەیان لـە پـاڵ حـەزرەتی یونسدا ناشت (على نبينا و عليه السلام).

سلیمان خان بــە سـەربەخۆیی دەسـتیدایە کاروبـاری حکومـەتی کوردسـتان. پـاش شاسەفی، (شاعەباسی دووەم)یش گرنگیەکی تایبەتی بەم سلیمان خانە دا. تا لە سالی ۱۰٦٦ی کۆچیدا، سلیمان خان کۆچی دوایی کرد. ماوەی حوکمرانی سلیمان خان، (۲۰) ساڵ بوو. ئینجا شاعەباسی دووەم بە قسەو راویژی (مورید سولتانی کەلهور) کە یەکیك بوو لە خزمەکانی سلیمان خان و خاوەنی رای زیریـن و فکـری بـەتین بـوو، کوردسـتانی بەسەر چەند بەشیکدا دابەشکرد، هــەر بەشـەی دا بـە یـەکیك لـە خـەلکی کوردسـتان و کەسوکاری سلیمان خان. ( ایالت)ی سنەی لەگەڵ ناوچەکانی لای خۆرهەڵاتیەوە، دایـە دەسـت (کەلبعـەلی خـان– کلبعلیخـان)ی کـوری سـلیمان خـان و حکومـەتی مـــەریوانی تەسلیمی (خەسرەوخان)ی کوری دووەمی سـلیمان خـان کـرد. سـەقزو سـیاکۆی دا بـە (سـولتان)و، ناوچـەی پلنگـانی سـپارد بـە (موریـد سـولتان). ناوچـەکانی شـارەزوور و شاربازێری بە (محەمەد خانی گورجی) بەخشی.

## باسی حکومەتی (کەلبعەلی خان)ی کوری سلیمان خان لە کوردستاندا

کەلبعەلی خان لـە (۱۰٦۷)ی کۆچیـدا لـە (ایـالت)ی سـنەدا دامـەزرا، دادپـەروەری و ئینسـافی کـردە پیشـەی خـۆیو نـاوو ناوبـانگیکی باشـی بەدەســتهینا، لــە دەربــاری شاعەباسی دووەمدا بووە جیگەی بـرواو متمانەیـەکی بـێ ئـەندازە. هـەموو ناوچـەکانی کوردستانی خستە سەر سنەو بەوی سپارد (دەبـێ مەبەسـت شاعەباسـی دووەم بیـت– وەرگیر)و دانرا بە فەرماندەی سوپا بۆ گرتنی خوزسـتان. لـە گرتـن و داگـیرکردنی ئـەو مەملەکەتەدا، ئەوپەری مەردایەتی و جوامیری نواندو بە هـۆی ئەوەشـەوە لـە دەربـاری پاشادا بیئـەندازە بـەرز بـۆوە. (١٦) سـالی تـەواو بەسـەربەخۆیی حوکمـی کوردسـتانی

کردو، پتر لەوەی لە خەزینەی حکومەتی کوردستاندا جیگەی بیتەوە، زیری پاشەکەوت کردو سامانی کۆکردەوە. پاشان بە پیی ئەو ریسایەی بۆ ئادەمیزاد دانـراوە، لـە سـالی ١٠٨٢ی کۆچیدا، کۆچی دوایی کرد.

## باسی حکومەتی ( خان ئەحمەدخان )ی کوری کەلبعەلی خان لە کوردستاندا

لە هەمان سالدا، بە فەرمانی (شا سلیمان)[١٩]، خـان ئەحمـەدخانی کـورە گـەورەی (کەلبعەلی خـان) لـە جیگـەی دانیشـت. ئـەم خـان ئەحمـەد خانـە، کـاتیك چـووە سـەر کورسی (ایالت)، ئەوپەری بەزەیی و میهرەبانی بەرامبەر دۆسـت و دوژمـن و دوور نزیـك دەنوانـد. لـە بەخشـندەییو سـەخاوەتدا، حاتـەمی دووەم و خاقـانی دووەم بـوو. لـە ماوەیەکی کەمدا، گەنجینەکەی باوکی کە پـر بـوو لـە زیـرو گەوهـەر بـە بـادا. ئـەوەندە زیری دا بە خەلك، لە ناو عەوامدا بە (خـانی زیریـن– خـان زرینـە) ناوبـانگی پـەیداکرد. زۆربـەی کـاتی خـۆی بـە رابـواردن و بـەزم و شـادی دەبـردە سـەر. لـە هیـچ جـۆرە رابواردنیکـی شـەرعیو ناشـەرعی خـۆی نەدەپاراسـت. زیـادەرەوی لـە بـەزم و خۆشـگوزەرانیدا بـووە هـۆی پشـیویو پاشـاگەردانی لـە ولایەتەکـەیدا. خەسـرەوخانی مامی، بی نەزمی ویلایەت و وردو درشتی رەفتارو کارە دزیوەکانی خان ئەحمـەد خـانی لای شاسـەفی[٢٠] خسـتەروو پیـی راگـەیاند. شاسـلیمان حکومـەتی کوردسـتانی بـە خەسرەو خان سپاردو خان ئەحمەد خانی لەسەر کار لابرد.

## باسی حوکمرانی ( خەسرەو خان )ی مامی خان ئەحمەد خان

خەسرەوخان، کە لەوکاتەدا لە مەریوان بوو، بە شادمانی ئەسپی سەرکیشی بەختی دەستەمۆکردو بەرەو سنە تاویدا. کتوپـر خـۆی کـرد بـە سـنەدا، خـان ئەحمـەد خـانی گرت، ناردی بۆ ئەسـفەهان و، خـۆی لـە سـالی ١٠٩١ی کۆچیـدا ئـالای سـەرۆکایەتی لـە

کوردستاندا هەلکرد. ئەم خەسرەوخانە پیاویکی زالم و ستەمکار بوو. دەرگای زولم و زۆری بە رووی خەلکی ویلایەتدا کردەوە. رەفتارەکانی تەنگیان بە خەلکی مەملەکەت هەلچنیو چوونە دەرباری شا بۆ شکایەت. شاسلیمان بە میهرەبانی شاهانەی خۆی دلخۆشی نارازییان دەداتەوەو بە دلنەوایی کردنەوە دەیاننیریتە لای خەسرەوخان. خەسرەوخان لەم لوتفە شاهانایە شەرم نەیگرت و دەستی لە زولم و دەستدریژی هەلنەگرت. ئەوانەی بۆ نارەزاییو شکایەت روویان لە دەرباری شا نابوو، هەر یەکەیانی بە جۆریك، تووشی کارەسات کردو بە بیانوویەك دەریکردن و کوشتنی. راستی مەسەلەکە بۆ جاری دووەم عەرزی شاسلیمان کرا. خەسرەو خانی بانگکرد بۆ ئەسفەهان و پاش گەیشتنی فەرمانی دا سزابدریو بکوژریت. دەستوپیوەندەکانی پاشا، لە (مەیدانی شاهی)ی ئەسفەهاندا کوشتیان و لە ناویانبرد. ماوەی حوکمرانی خەسرەوخان لە کوردستاندا کەمتر لە دوو سالّ بوو. لە سالی ۱۰۹۳ی کۆچیدا بە فەرمانی شاسلیمان، (تەیمورخانی ئاجرلویی) بووە حاکم و فەرمانرەوای کوردستان.

## باسی حکومەتی ( تەیمور خانی ئاجرلویی ) لە کوردستاندا کە لە بنەمالەی ئەردەلانییەکان نیە

ئەم تەیمورخانە لەگەلّ خەلکی مەملەکەتدا هەلسوکەوتی باش و رەفتاری جوان بوو. لەگەلّ گەورەو بچووکی خەلکی ویلایەتدا، برایانە رەفتاری دەکرد. (٦) سالّ بەم شیوەیە لە کوردستاندا حوکمرانی کرد. پاش (٦) سالّ و لە سالی (۱۰۹۹)ی کۆچیدا، دووبارە خان ئەحمەد خانی کوری کەلبعەلی خانی ئەردەلان کرایەوە بە حاکمی کوردستان و بە فەرمانی شا سلیمانی سەفەوی روویکردە سنەو شارەزوور. ئەم خان ئەحمەد خانە کە بۆ جاری دووەم لە ویلایەتی کوردستاندا سەربەخۆیی کەوتەوە دەست زیاتر لە جاران زیادەرەوی لە خۆشگوزەرانیو رابواردنی رەواو نارەودا کرد. کە سلیمان پاشای بابان بە حالی خان ئەحمەد خانی زانی، خەلکیکی زۆری لە تایەفەکانی

کوردو عەرەب لەگەڵ خۆیدا ریکخست، لە سالی ۱۱۰۳ی کۆچیدا بیباکانە هیرشی کردە سەر سنوورەکانی کوردستان و، مەریوان و سەقزو هەورامانی گرت (زۆراب سولتان– سهراب سلطان)ی حاکمی سەقزو (ئیبراهیم بەگی میر ئەسکەندەری)ی حاکمی مەریوانی کوشت. خان ئەحمەد خان خۆی نەچوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی مەسەلەکەی بە شاسلیمان راگەیاند. لە لایەن شاسلیمانەوە، (رۆستەم خانی سوپاسالار) و عەباس خانی زیاد ئوقلی– عباس خان زیاد اقلی) بە سوپایەکی ئامادەوە نیردران بۆ یارمەتیدانی خان ئەحمەد خان. لە دەشتی مەریواندا هەردوولا بە یەك گەیشتن. سوپای سلیمان پاشا شکاو پتر لە (٤) هەزار کەسیان کوژران و یە دیل گیران. پاش ئەم سەرکەوتنە دیارو گەورەیە، عەباس خانی زیاد ئوقلی بە فیڵ و هەلخەلەتاندنی لە لایەن (قاسم سولتان)ی هەورامییەوە، تۆمەتی ئەم سەرکیشیەی سلیمان پاشا دەداتە پاڵ والی و خەلکی کوردستان. ژمارەیەك لە گەورەپیاوانی کوردستان لەگەڵ (۱۲۰۰) کەس لە رەعیەتی ئەم مەملەکەتە، گرفتاری ئازارو ئەشکەنجە دەکاو پاش تالآنکردنی مولك و مالیان، فەرمانی کوشتنی ئەو بیچارانە دەدات و لە لاشەو سەری ئەو بیچارانە، گردیك لە دەشتی مەریوان دروستدەکات. ئیستاش کە سالی ۱۳۰۹ی کۆچییە، ئەو گردە هەر ماوەو بە (کەللەکیو– کلین کوە) بەناوبانگە. واتە ئەو کیوە لە کەللەی مرۆڤ دروستکراوە. شاسلیمان لە تۆلەی ئەم کارە وەحشیانەیەدا، عەباس خانی سەردار لە مەیدانی ئەسفەهاندا لە سیدارە دەداو فیری مانای (سەرداری)ی دەکات. لە سالی ۱۱۰۷ی کۆچیدا شا سولتان حسین(۲۱)، ئەحمەد خان لە سەرکار لادەباو (محەمەد خان)ی کوری خەسرەوخانی کوژراو لە حکومەتی کوردستاندا دادەنیت. ماوەی ئەم حوکمرانیەی دووەمی خان ئەحمەدخان، ۹ سالێ ناتەواو بوو.

## باسی حوکمرانی ( محەمەد خان )ی کوری خەسرەوخان لە کوردستاندا

کە (محەمەد خان) لـە (ایالت)ی سـنەدا جیگـیر بـوو، دەسـتیکرد بـە چاکردنـەوەو ئاوەدانکردنەوەی ویلایەت. لەبەرئەوەی بەهۆی کردەوە وەحشـیانەکەی عـەباس خـانی زیـاد ئوقلییـەوە کـە پیشـتر باسـکرا، خـەلکی کوردسـتان رەنجـابوون و کۆمـــەلیك لـــە میرەکـانی ئـەو ناوچەیـە نیشـتمانیان جیهیشـتبوو و پـەنایان بردبـــووە بـــەر دەولـــەتی عوسمـانی، شاســـولتان حســـین، بـــۆ دلنـــەوایی‌و کۆکردنـــەوەی ئەوانـــەو ریکخســـتنی کوردستان و ئازەربایجان، (حسین خانی لور)ی کردە (سەردار) و ناردی بۆ کوردسـتان. ئـەم سـەردارە گرنگییـەکی بیئـەندازەی دا بـە ئـاوەدانی کوردسـتان و بـاج و خـــەراجی کوردستان و ئازەربایجان.

بەهەرحاڵ، لە سالی ١١١٣ی کۆچیـدا خـەلکی کوردسـتان دژی ئـەم محەمـەد خانـە راپەرین و لە دەرباری شاسولتان حسیندا شکایەتیان لیکرد. بە حوکمی پاشا، محەمـەد خـانی ئـــەردەلان لابـــراو (محەمـــەد خـــانی گورجـــی) کرایـــە بەرپرســـیاری حکومـــەتی کوردستان‌و بەرەو کوردستان رەوانەکرا. ماوەی حوکمی محەمـــەد خـانی ئـەردەلان (٦) سالێ تەواو بوو.

## باسی حکومەتی ( محەمەد خانی گورجی لە کوردستاندا )

ئەم محەمەد خانی گورجییە کە هاتە کوردسـتانەوە، خـۆی بـە سـوننی مەزهـەب و پەیرەوی ئیمامی شافیعی حسـابکردو لـەکاتی بەجیگـەیاندنی پینـج فەرزەکـەدا لەگـەڵ خەلکدا نویژی جەماعەتی دەکرد. هەر ئەم مەسەلەیە، لە دەرباری (شاسەفی)دا[٢٢] بوو بە هـۆی لابردنـی ئـەو بیچارەیـە. هیـچ زانیارییـەکی تـر سـەبارەت بـە (محەمـەد خـانی گورجـی) لەبەردەسـتدا نیـە. مـاوەی حوکمرانیەکـەی ٣ سـاڵ بـوو. لـە سـالی ١١١٦ی کۆچیدا، بە فەرمانی شاسولتان حسین، حکومەتی کوردستان بە (حەسەن عەلی خان)ی

کوری (محەمـەد موئمـن خـانی ئیعتیمـادو ددەولـە– محمـد مؤمـن خـان اعتمـاد الدولـة) سپێردرا.

## باسی حوکمرانی ( حەسەن عەلی خان )ی کوری ( محەمەد مۆمن خانی اعتماد الدوله ) کە لە بنەماڵەی ئەردەڵانییەکان نیە

ئەم حەسەن عــەلی خانـە بێئـەندازە پابـەندو سـووربو لەسـەر ڕێبـازی شـیعەگەری. لەگـەڵ خـەلکی کوردسـتاندا، کـە هـەموویان سـوننین و پـەیرەوی ئیمــامی شــافیعین، دەمارگیرانەو بە پێچەوانەی یاسـای خێـڵ و عەشـیرەتییەوە ڕەفتـاری دەکـرد، گیـان و مالی خــەلکی ئـەم ناوچەیـەی وەکـو شـیری دایکـی، بـە حـەڵاڵ دەزانـی بـۆ خـۆی. بـە ڕیکـەوتیکی خودایـی، ڕۆژیـك بـە نیــازی ڕاو لــە (دار الایالــە)ەوە ســواردەبێ‌و بــەلای مەرقـەدی حـەزرەتی ئیمـامزادەی ئـازادە (عومـەری کـوری عـەلی)دا (ســلام الله علیــە) تێدەپەری کە دەکەوتە بەرامبەری (دار الحکومە)ی سنەوە. سەبارەت بەو کەسەی لـەو شـوێنە شـەریفەدا نیـژراوە، پرسـیاری کـرد. گوتیـان ئەمـە (پیرعومـەر)ە. ئـەم پیــاوە وەحشیە بێئەدەبە، هەر کە نـاوی (عومـەر)ی بـەرگوی کـەوت، حوکـم دەکـات کـە ئـەو شوێنە پیرۆزە ویران بکریت. لـە کـاتی گەڕانـەوەدا، کـاتیك کـە دەگاتـە دەروازەی (دار الایالـە)، تووشــی ئـــازاریکی دڵ دەبـــێ‌و هـــەر لـــەویدا بـــە هـــۆی تونـــدی‌و بـــە هـــیزی نەخۆشیەکەیەوە دەکەوێ. کە دایك و ژن و منداڵــی دینـە سـەری‌و لـە حـالی دەپرسـن، هەر ئەوەندە وەڵامی دایکی دەداتەوە کە: دایە پیری عومەرییەکان لیی دام. پـاش ئـەم قسـانە، جیـهان بـەجیدیلێ و تەشـریف دەبـات بـۆ ئـەو شـوینەی کـە حەقـــە. مـاوەی حوکمرانی ئەم وەحشی نەژادە، دوو سالی ناتـەواو بـوو. لـە سـالی ۱۱۱۸ی کۆچیـدا بـە فـەرمانی شاسـولتان حســین، (حســین عــەلی خــان)ی بــرای دەکریتــە فــەرمانڕەوای کوردستان و ڕەوانە دەکریت.

## باسی( حسین عەلی خان )ی برای حەسەن عەلی خان لە کوردستاندا كە لە بنەماڵەی ئەردەڵانییەکان نیە

ئەم حسین عەلی خانە، لەبەر دەمارگیریی مەزهەبی، کە یەکێکە لە ئەنجامەکانی وەحشیگەری، دەرگای زولم و ستەم بە رووی خەڵکی کوردستاندا دەکاتەوە. پاش سالیك خەلك لە دژی رادەپەرن، رووداوەکەنە دەرباری پاشای ئیران و لەسەر حوکم لای دەبەن و، (کەیخەسرەو بەگ) ناویك بە فەرمانی حوکمرانی کوردستانەوە، لەگەل خۆیاندا دینن. ماوەی حکومەتی حسین عەلی خان یەك ساڵ و چوار مانگ بوو.

## باسی حوکمرانی کەیخەسرەو بەگ، یاساولی شاسولتان حسین كە لە بنەماڵەی ئەردەڵانییەکان نیە

کاتیك کە (کەیخەسرەو بەگ) دەچێتە ناو (دار الايالە)ی کوردستانەوەو خەلك هەولدەدەن بزانن چ جۆرە کەسیکە، بۆیان دەردەکەوێ پیاویکی سووك و نارەسەنەو لە سەرۆکایەتی مولك و پاراستنی مەملەکەت بیبەرییە. بە ناچار پاش یەك ساڵ لەسەر حوکم لایدەبەن و دەینیرن بۆ ئەسفەهان. ماوەی حوکمرانی ئەم خەسرەو بەگە یەك سالی ناتەواو بووە.

## باسی حوکمرانی ( عەباس قولی خان ) کە یەکێکە لە کورەزاکانی خان ئەحمەد خانی بەنی ئەردەڵان، لە کوردستاندا

پاش دەرکردنی کەیخەسرەو بەگ، ئەهلی مولك لە سالی ١١٢١ی کۆچیدا ئیمتیازی حکومەتی کوردستان دەدەن بە (عەباس قولی خان) ناویك کە لە کورەزاکانی خان ئەحمەد خانی کوری هەلۆخان بووە. هەموو ئەهلی مولك دەبنە ملکەچ و گوی بە فرمانی. شا سولتان حسین-یش بە لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی سەردەم، جلوبەرگ و فەرمانی حکومەتی بۆ دەنێرێ. لە سالی ١١٢٨ی کۆچیدا شا سولتان حسین دامرکاندنەوەی فیتنەی ئەفغانە ئەبدالییەکان (افاغنه ابدالی) لە (دار الملك)ی قەندەهار، بەم عەباس قولی خانەو خەلکی کوردستان دەسپێرێ[٢٣]. عەباس قولیخان لەگەڵ (٨) هەزار سواردا لە کوردستانەوە بەرەو مەبەست دەکەویتەرێ. کاتیك کە سەربازەکانی کوردستان دەگەنە تاران شیواوی و بیسەرو بەری سەلتەنەتی شاسولتان حسین-یان بۆ دەردەکەوێ‌و لە عەباس قولی خان هەلدەگەرینەوەو دەگەرینەوە بۆ کوردستان. عەباس قولی خان بە تەنیا دەچیتە دەرباری شاسولتان حسین و، ئەم کردەوەیەو تۆمەتی گەرانەوەی سوپاکە دەداتە پاڵ (عەلی قولی بەگ)ی کورەزای (کەلبعەلی خانی بەنی ئەردەلان) کە پیشتر باسیکرا. شا سولتان حسین خودی ئەم عەباس قولی خانە لەسەرکار لادەبات و زیندانی دەکات. ماوەی حوکمرانیەکەی (٨) ساڵ بوو. ئینجا هەمان ئەو (عەلی قولی بەگ)ە نەناسراوە دەکاتە حوکمرانی کوردستان، جلوبەرگ و فەرمانی حکومەت و نازناوی خانی وەکو ریزلینانیك بۆ دەردەکات و لەگەڵ (عەلی خانی فەراشخەلوەت- علی خان فراشخلوت)دا، بە سەرفرازیی، رەوانەی کوردستانی دەکات.

## باسی حکومەتی ( عەلی قولی خان ) کە لە کورەزاکانی ئەحمەد خانی بەنی ئەردەلانە، لە کوردستاندا( ٢٤ )

چیرۆکی ئەم عەلی قولی خان ناوە کە کورەزای کەلب عەلی خانی بەنی ئەردەڵانە: بە هۆی چەرخی زەمانەو رۆژگارەوە تووشــی هــەژاریو نەگبــەتی بووبــوو، و لــە یــەکێك لــە گوندەکانی (خورخورە)ی کوردستاندا کە ناوی (شیخلە)یە نیشتەجێ بوو، و شــەوو رۆژ بۆ بەدەستهێنانی بژیوی ژیان کۆششی دەکرد. ئەو چەند کەسەی لەگەڵیدا بوون و لــەم دۆخی تەنگانەیەیدا یاریدەدەری بــوون، هەمیشــە لــە رووی میهرەبانیــەوە پێیــاندەگوت لیرە برۆو سەفەر بکە بۆ شوینیکی تر بەلکو لە دەردی هەژاری رزگارت بێ. عــەلی قــولی بەگ لەوپــەری نائومیدییــەوە وەڵامــی دەدانــەوە کــە ئەگــەر خــودا بینــیرێ، بــۆ گونــدی (شیخلە)یشی دەنیرێ. ئەم قسەیە لە کوردستاندا بڵاوەو بووە بە پەندو مەسەلە.

بەهەرحاڵ، کاتێ عەلی خان کە هەلگری جلوبەرگ و فــەرمانی شــاهی بــوو، گەیشــتە سنە، سۆراخی عەلی قولی بەگی لە قــەڵای (شــیخلە)دا دۆزیــەوەو روویکــردە ئــەوێ. کــە گەیشتە نزیکی ئەو گوندە، چەمیکی بەرچاوکەوت کە پەرینەوە لیــی بــە بــێ شــارەزایی زەحمەت بوو. هەر لەوکاتەدا عەلی قولی بەگ و کۆمەلی لە خەلکی شــیخلە عــەلی خــان- یان دی، بواری ئاوەکەیان لی شاردەوەو بەرەو یــەك فرســەخ ســەرووتر رینماییــان کــرد، نەوەکا خۆیو هاوریکانی ببنە میوانی گوندەکە. عــەلی خــانی بــەرگی میرایــەتی هینــەر، هەرچۆنیك بوو لە ئاوەکە پەرییەوەو لە بارەی عەلی قولی بەگەوە پرسیاری کــرد. ناچــار خەلکی ئاوایی بە هەزار ترس و ئومیــدەوە عــەلی قــولی بــەگیان هینــابۆ لای. عــەلی خــان ئەوپــەری ریــزی لیگــرت، بــەرگی شــاهی کردەبــەریو فــەرمانی حکومــەتی کوردســـتانی پیسپارد. یەکسەر عەلی قولی بەگ بوو بە عـــەلی قــولی خــان و بــە خــەلکی ئــاوایی گــوت: نەمگوت ئەگەر خودا بینیرێ بۆ گوندی شیخلەشی دەنیرێ؟

پاش دوو-سێ رۆژ، کە میرەکانی کوردســتان بــە مەســەلەکەیان زانــی، روویــانکردە بارەگای عەلی قــولی خــان و پــاش ئامــادەکردنی پیویســتیەکانی ئەتــەکیت و رازاندنــەوە بەرەو سنە کە (پایتەخت- دار الملك)ی کوردستانە، بەرییان خست و لە ســالی ١١٢٨ی کۆچیدا گەیشتە سنە.

هەر لەم کاتەدا خەلکی لورستان لە شاسولتان حسین هەلدەگەڕینەوە. شاسولتان حسین-یش هەر ئەم عەلی قولی خانە لەگەڵ سوپای کوردستاندا دەکاتە بەرپرسیاری تەمیکردنی خەلکی لورستان و بەختیاری. عەلی قولیخان لە جیبەجیکردنی ئەم ئەرکەدا ئەوپەری دلیری و ئازایەتی دەنوینێ. لە کاتی روبەرووبوونەوەی لەگەڵ سوپای لورستان و بەختیاریدا، بە پیی یاسای سەرکردە ناودارەکان، بالی راست و بالی چەپی سوپا ریکدەخات و خۆیشی دەچیتە ناوەند (قلب)ەوە. سەرەتاکانی نەبەرد لە هەردوولاوە دەرکەوتن. سوارەکان لە مەیداندا تاوی ئەسپەکانیان دا، دلاوەرانی کوردستان کەوتنە جۆش و خرۆش جلەویان بۆ کەفوکولی پەنگخواردووی لاویتی بەرەللا کردو ئاوزەنگییان لیدا، ئەسپیان تاوداو شمشیریان وەشاند. سوارەی بەختیاری کەمیك بەرگرییان کردو هیرشی مەردانەیان کرد. سەرەنجام بە نەنگ و شورەییەوە لەم جەنگە گەرانەوە. دلیرانی کوردستان دوایان کەوتن، کۆمەلیکیان دیل کردو گەلیکیان دایە بەر شمشیری خویناوی. پاش ئەم رووداوە حاکمی لورستان لە لایەن عەلی قولی خانەوە دلنیا کرایەوە بە دەستوودیارییەکی فراوانەوە چووە لای. عەلی قولی خان لەگەڵ چەند کەسیك لە سەرۆکەکانی بەختیاریدا ناردی بۆ دەرباری شاسولتان حسین و بووە تکاکاری گوناهەکانی. شاسولتان حسین دلنەوایی حاکم و سەرۆکەکانی لورستانی کردو ناردنیەوە بۆ ولاتی خۆیان. عەلی قولی خان بەوپەری شانازیو سەنگینییەوە گەرایەوە بۆ سنە. تا لە سالی ١١٣٢ی کۆچیدا لاوازیو سستییەك لە سەلتەنەتی شا سولتان حسیندا هاتە ئاراوەو لە هەموو لایەکەوە ئەفغانیەکان هەراو ئاشوبیان نایەوە. (خانە پاشا)[٢٥]ی کوری (محەمەد پاشای بابان) کە ئامۆزای سلیمان پاشا بووەو لەو میژووەدا حاکمی سلیمانی و بابان بوو، ئەم دەرفەتەی قۆزتەوە، بە لەشکریکی ریکوپیکەوە بە مەبەستی گرتنی ویلایەتەکانی ئەردەلان کەوتەرێ و پەلاماری سنووری مەریوانی دا. لەبەرئەوەی هیچ کۆسپیکی لە بەردەمدا نەبوو، تا پینج فرسەخی شاری سنە هاتە پیشەوە. عەلی قولی خان لە

توانایدا نەما لەوە زیاتر دوابکەوێو بەرەو ئەسفەهان هەڵات. گەورەپیاوانی کوردستان، لەوکاتەدا بە ناچاری پاراستنی ماڵ و گیانی خۆیان لەوەدا بینی کە ملکەچی خانە پاشا بن. سەییدو زاناو شیخەکانی ناوچەکە، چوونە دەرەوە بۆ پیشوازی خانە پاشاو هینایانە ناو شاری سنەوە.

## باسی حوکمرانی ( خانە پاشای بابان ) لە کوردستاندا

خانە پاشا لە سالی ١١٣٢ی کۆچیدا بوو بە میرو حوکمرانی کوردستانی ئەردەڵان و، لە کەرکوکەوە تا هەمەدان کەوتە ژیر فەرمانی ئەوەوە. ئەم خانە پاشایە هەولیکی زۆری دەدا ریساکانی دادپەروەری پیادە بکات و کۆششی دەکرد خەلکی کوردستان رازیبکات. بێ سلکردنەوە (احراج) دەبی بلیین لە سەردەمی حوکمرانی ئەودا خەلکی بە تەواوی ئاسوودە بوون. لەبەر پەشیوی سەلتەنەتی سەفەوی و شیواوی دەولەتی ئیران و باڵادەستبوونی ئەفغانەکان، کەس توانای نەبوو رووبەرووی خانە پاشا بووەستێو دەربیکات. لەبەرئەوە خانەپاشا بە ئیرادەیەکی پۆڵایین و بروا بە خۆبوونەوە کاروباری حکومەتی بەریوەدەبرد. مزگەوت و قوتابخانەیەکی گەورەی لە شاری سنەدا دروستکرد. دوو منارەی زۆر بلندی لە مزگەوتەکەدا بەرزکردەوە. ئەم منارەو مزگەوتە یەك سالْ مانەوە. (ئەمانەللاخان– امان الله خان)ی گەورەی والی کوردستان، لە رووی دەمارگیریو غیرەتی خیڵایەتییەوە مزگەوتەکەی ویرانکرد، منارەکانی رووخاندو باخیکی لە جیگەی (مزگەوتەکە) دروستکرد، کە ئیستاش ماوەو بە باخی (فیردەوسی– فردوسی) بەناوبانگە.

بەهەرحاڵ، خانەپاشا چوار سالی تەواو لە سنە مایەوەو لە سالی ١١٣٦ی کۆچیدا (عەلی خان)ی کوری کردە حاکمی سنەو خۆیشی ریگای مەملەکەتی بابانی گرتەبەر. هەرچەندە عەلی خان لە سەرەتای تەمەن و هەرەتی لاوییدا بوو، بەڵام بە هیچ جۆریك بە دوای رابواردن و خۆشگوزەرانیدا نەدەگەراو، رۆژگاری ژیانی لەگەڵ زاناو شاعیراندا

بەسەر دەبرد. لە سالی (١١٤٢)ی کۆچیدا ناوبــانگی دەسـەڵاتی نادرشـای ئەفشـار، کـە لەوکاتەدا سوپاسالاری (شاتەهماسبی دووەم) بوو و بــە (تەهماسـب قـولی خـان) ناسـرا بوو، بە سەرتاسـەری ئـێراندا بڵاوبـۆوە. عـەلی خـان بـی هیـچ شـەڕو کیشـەیەك، سـامی لینیشت و روویکردە ویلایەتەکەی خۆی. ماوەی حوکمرانی عەلی خــان لـە کوردسـتاندا، ٦ ساڵ بوو. شاتەهماسبی سـەفەوی پـاش راویـژو پیباشـبوونی تەهماسـب قـولی خـانی سوپاسالار کە هەمان نادر شایە، (عەباس قولی خـانی ئـەردەڵان)ی نـارد بـۆ حکومـەتی کوردستان و دووبارە چرای بەنی ئەردەڵان هەلگیرسایەوە. بــەڵام زۆری پینـەچوو، ئـەم دنیایەی جیهیشت.

## باسی حکومەتی (سوبحان ویردیخان)ی بەنی ئەردەڵان لە کوردستاندا

(سوبحان ویردیخان– سـبحان وردیخـان)ی کـوری، بـە حوکمـی مـیرات لـە جیگـەی (بـاوکی) سـەرۆکایەتی بەدەسـتهیناو لـە سـالی ١١٤٣ی کۆچیــدا بــوو بــە حوکمرانــی ئەردەڵان. ئەم سوبحان ویردیخانە پیاویکی خواپەرست و لە خواتـرس بـوو، بـە یاسـای جوامیریو[٢٦] و لیهاتوویی رەفتاری دەکـرد. هـەولیکی زۆری دا بـۆ فراوانکردنـی شـاری سـنەو دەسـتپیاهینان و چاککردنـەوەی (دار العمـارە–رەنگـە راسـتیەکەی دار الامــارە بیت، واتە خانەی یاخود بینای حکومەت و حوکمرانی. وەرگیر).

لە سالی ١١٤٧ی کۆچیدا نادرشا بە مەبەسـتی گرتنـی (شـیروان) لـە ئەسـفەهانەوە کەوتـەرێ. لـە (١٨ی سـەفەر)ی هـەمان سـالدا هاتـە نـاو شـاری سـنەوەو لـە سـالۆنی (دیوەخانی) روو لە باکوری بینای حکومەتدا دابەزی، کە بە سـالۆنی (روو لـە تەپولـە– روبتپولە) بەناوبانگەو لەوکاتەدا دریژیەکەی (٢٠ گەز) و پانییەکەی (١٢ گەز) بــووە[٢٧]. نادر شا لەوێ ریگەدەدا سەردانی بکریت و رووەکاتە ویردیخانی حاکمی کوردستان کـە وەکـو خزمـەتکار لـە بەشـی خـوارەوەی دیوەخانەکـەدا راوەسـتابوو، و پیــی دەلیـت:

سوبحان ویردیخان، ئیمە نەهاتووین جیگەکەی تۆ داگیربکەین. دیوەخانەکەی ئیوە زۆر گەورەیە، با لایەکی ببیتە شوینی دانیشتنی ئیمە بۆ ئەوەی خەریکی سەلتەنەت بین، لاکەی تریشی مالی ئیوە بیت و حوکمرانی خۆتان بکەن. لە پاداشتی ئەم مەرحەمەتە (نادری)یەدا سوبحان ویردیخان ١٤ هەزار مەن[٢٨] رۆن و (١٠) هەزار تمەن زیری پیشکەش دەکات.

بەهەرحاڵ، پاش ئەوەی نادرشا لە (شەوالی ١١٤٨)ی کۆچیدا، لەسەحرای (موغان)دا تاجی لەسەرنا، بە فەرمانی ئەو پاشایە سوبحان ویردیخانی والی کوردستان لەسەر کار لابراو (مستەفاخان)ی برای سوبحان ویردیخان کرا بە والی کوردستان. ماوەی حوکمرانی سوبحان و ویردیخان (٥) ساڵ و (٨) مانگ بوو.

مستەفاخان روویکردە حکومەتی سنەو لە (محەرەمی ١١٤٩)دا گەیشتە بارەگای (ایالت). پاش سێ– چوار مانگ ئەهلی مولك دژی راپەرین و، دووبارە سوبحان ویردیخان لە هەمان سالدا کرایەوە بە حاکمی کوردستان. نادرشا پاش گەرانەوەی لە سەفەری هندستان و، رۆیشتنی بۆ گرتنی (خوارەزم) و تەمیکردنی خیلی (بارس) و والیی ئەو مەملەکەتە، لە سالی ١١٥٠ی کۆچیدا سوبحان ویردیخانی والی کوردستانی بانگکردە حوزووری خۆیو (ئەحمەد سولتان)ی کوری سوبحان ویردیخانی کردە حوکمرانی کوردستان کە لە سەفەری هندستاندا لە هەموو شوینیکدا وەکو سەرکەوتنەکانی یاوەری بوو. بە نازناوی (خان) سەرفرازی کردو لە کۆتایی خاکی هەمەدانەوە تا سەرەتای خاکی (   )[٢٩]ی بەو سپارد. ماوەی ئەم حکومەتەی دووەمی سوبحان ویردیخان (٥) سالی تەواو بوو.

## باسی حکومەتی (ئەحمەد خان)ی کوری سوبحان ویردیخان و پەنابردنی بۆ دەولەتی عوسمانی

بەهەرحاڵ، ئەحمەد خان کاتێك کە گەیشتە پایتەختی کوردستان، بە لووتبەرزی و رواڵەت پەرستییەکی (تجمل) بێ سنوورەوە دەستیدایە حوکمرانی. لە ساڵی ١١٥٤دا، کاتێك نادرشا روویکردە (..؟)[٣٠]، لەبەرئەو دلێریو جوامێرییەی ئەحمەد خان لە سەفەری پڕ لە سەرکەوتنی هندستاندا نواندبووی، بە پێویستی زانی لەم سەفەرەشدا لەگەڵیدا بێ. (ئەحمەد خان)ی بانگکردو بۆ جاری سێیەم سوبحان ویردیخانی کردە حاکمی کوردستان. ئەمجارە سوبحان یەك ساڵ[٣١] و سێ مانگ حوکمرانی کرد. دووبارە بە فەرمانی نادرشا لابراو خان ئەحمەدخان دانرایەوە. لە ساڵی (١١٥٥)دا ئەحمەد خان گەیشتە بارەگای حوکمرانی. لەم ساڵەدا قاتوقڕیو گرانی بەجۆرێك بڵاوبۆوە کە نان نرخی گیانی هەبوو، و ئەوەی دەمرد رزگاری دەبوو. ئەحمەد خان دەرگای خێرو چاکەی کردەوەو بۆ پاراستنی گیانی هەموو خەڵکی کوردستان، گەنم و جۆو دانەوێڵەی عەمبارە (نادر)یەکانی بەسەر فەقیرو هەژاردا دابەشکرد، بەڵکو گیانی خۆیان لەم تەنگانەیە قوتاربکەن. بە رێکەوت، لەم کاتەدا نادرشا فەرمانبەرێکی نارد بۆ ئەوەی عەمبارەکانی کوردستان، وەکو ئازووقەی سوپا بەرێت بۆ ئازەربایجان. کاتێك فەرمانبەرەکە هاتە کوردستان و عەمبارە دەولەتییەکانی بە بەتاڵی بینی، تۆمەتی جۆراوجۆری بۆ ئەحمەدخان هەڵبەست و بە ناوەرۆکی جیاجیا عەریزەی بۆ نادرشا نووسی. عەریزەی ئەم فەرمانبەرە، ئاگری رق و توورەیی نادرشای هەڵگیرساندو فەرمانی کوشتنی خان ئەحمەد خانی دەرکرد. دۆستەکانی خان ئەحمەد خان پێشوەخت ئەم هەواڵەیان پێراگەیاندو خان ئەحمەد خان بە ناچاری لەگەڵ (٢) هەزار سوار لە کەسوکارو پیاوەکانی خۆیدا بەرەو دەولەتی عوسمانی هەڵات. کە گەیشتە شارەزوور، (تایەر بەگی ئیل بەگی) کە یەکێك بوو لە گەورەپیاوانی جاف، کەوتە دژایەتی کردنی. ئەحمەد خان بە زەبری هێز گرتی و سزای داو، لەوێوە چوو بۆ سلێمانی. (خالید پاشای بابان) لە رووی ملکەچی و تەسلیم بوونەوە، بە دەستودیاری فراوانەوە چوو بۆ بارەگای خان ئەحمەد خان و لە حکومەتی باباندا ئازادی تەواوی

دایە. (خان ئەحمەد خان) لەویوە روویکردە موسل، حاکمی موسـڵ ریـی دژایـەتیکردنی گرتەبەر. ئەحمەد خان بە زۆری هیز قـەڵاو شـارەکەی گـرت، حاکمەکـەی دەسـگیرکردو کوشتی. (محەمەد چەلەبی) ناویکی لە جیگەی داناو، لەویوە بـەرەو دیاربـەکرو حەلـەب کەوتەرێ. پاش مانگیك و چوار رۆژ گەیشتە شاری ئەستەمووڵ. بـە فـەرمانی سـولتان، لە رۆژی گەیشتنیدا، کۆمـەلیك لـە گـەورەپیاوان و پاشـاکانی دیـوان و (شـیخ الاسـلام) چوونـە پیشـوازی کردنـی. بەوپـەری سـەربەرزی و ریـزەوە لـەو مالـەدا کـە لـــە شــاری ئەستەمووڵ بۆیان ئامادەکردبوو، دابـەزی. ئەحمـەد خـان لەگـەڵ هـەموو یاوەرەکـانیدا بوونە میوانی خوانی سولتان. پاش ماوەیەکی کەم، بە فەرمانی سولتان کرا بە حـاکمی (ئەدرنە) و لەگەڵ یاوەرەکانیدا روویکردە ئەوێ.

لـەملاوە، کـاتیك هـەوالی هـەلاتنی ئەحمـەدخان گەیشـتە نـادر، لـە ســالی ١١٥٦دا (حاجی مــەولا ویردیخـانی قاجـار)ی کـردە حـاکمی کوردسـتان و، سـوبحان ویردیخـانی بـاوکی ئەحمـەد خانیشـی کـردە (بەگلـەر بـەگ)[٣٢]ی تـاران. کـاتیك کـە حـاجی مــەولا ویردیخـان هاتـە کوردســـتان، لەبــەر لیکــدووری مــەیل و مەزهــەب، لەگــەڵ خــەلکی کوردستاندا نەگونجا، پاش یەك ساڵ لەسەر کار لابـراو سـوبحان ویردیخـان کـە بەگلـەر بەگیی تاران بوو بۆ جاری چـوارەم بـەرەو حکومـەتی کوردسـتان رەوانـەکرا. هـەروەها (نادرشـا) لەگـەڵ سـوبحان ویردیخـاندا نزیکـەی هـەزار کەسـی لـە ســوارەی ئــەفغان و خۆراسانی، بە فەرماندەیی (محەمەد رەزا بەگی گورجی) نارد بۆ ئەوەی لە کوردســتاندا بنکەیەکی سەربازی و چاودیری دابنین. ئەم محەمـەد رەزا بەگـە پیـاویکی تـوورەو دوو زمان بوو. بە زمانە تیژەکەی گەورەو بچووکی خەلکی ویلایەتی لە خـۆی هـەلگیرابۆوەو هەراسـانی کردبـوون. تـا ئەوپـەری توانــا هـــەولی دەدا ئــازارو ئەشــکەنجەی خــەلکی مەملەکەت بدات. سوبحان ویردیخانیش لە ترسی زەبرو زەنگـی نـادری (مەبەسـت نـادر شایە– وەرگیر)، تواناو جورئەتی ئەوەی نـەبوو باسـی بکـات و ریگـەی لیبگریـت. سـێ ساڵ بەم شیوەیە رۆژگاری بردەسەر. تا لە کۆتایی (جـەمادی دووەمـی سـالی ١١٦٠)ی

کۆچیدا هەواڵی کوژرانی نادرشای ئەفشار بڵاوبوەوە. لەبەرئەوەی سـەرەتا ئـەم هەواڵـە سامناکە گەیشتە سوبحان ویردیخان، بەبێ ئاگاداریی خەڵکی کوردستان محەمـەد رەزا بەگی سەردارو کۆمەڵیك لە میرەکـانی ئـەفغان و خۆراسـان بانگدەکاتـە لای خـۆی و بـە دریژی باسی کوژرانی نادر شایان بۆ دەکات و پێیان دەڵیت لەبەرئەوەی ئێـوە میوانـن، نامەوێ زیانی گیانیتان پێبگـات. تـا خـەڵکی مەملەکـەت بـەم هەواڵـەیان نـەزانیوە، بـە سەری سەلامەتەوە بچن بۆ خۆراسان. یەك هەزار تمەن پارەو (١٠) دەست جلوبـەرگیش دەدا بە محەمەد رەزا بەگ و میرەکانی ئەفغان و خۆراسان. هەر ئەو شەوە ئەو کۆمەڵـە گەورەیـە لـە ویلایـەت دەکاتـە دەرەوە. بـۆ بـەیانی کـاتیك کـە خـەڵکی کوردسـتان بـە کوژرانـی نادرشـاو هـەڵاتنی محەمـەد رەزا بـەگ و سـوارە ئـەفغانیو خۆراسـانییەکان دەزانن، خۆیان ئامادە دەکەن بۆ ئەوەی دوایانکەون. سوبحان ویردیخان پـاش کۆشـش و ماندووبوونیکی زۆر ریگەیان لیدەگریت.

پـاش تیپـەرینی (٧) مـانگ بەسـەر ئـەم رووداوانـەدا، لــە سـالی ١١٦١ی کۆچیـدا (ئیبراهیم خان)ی برازای نادرشا، کە بـۆ داوای تـەختی سـەلتەنەت راپـەریبوو، (حسـین عەلی خان)ی بە نی ئەردەڵانی نارد بۆ حکومەتی کوردستان چونکـە دەیزانـی خـاوەنی پیشینەیەکی دوورو دریژە لە خزمەتکردندا[٣٣]. هەر لەم سـالەدا سـوبحان ویردیخـانیش لـە شـاری هەمـەدان کۆچـی دوایـی کـرد. جەنازەکـەیان هینایـەوە بـۆ کیـوی (شـەیدا-شـیدا)ی کوردسـتان و لــەژیر گومــەزی (شــەیدا)دا کــە دەکەویتــە ســەر کیویکـــی بەرز، ناشتیان.

## باسی حکومەتی ( حەسەن عەلی خان )ی بەنی ئەردەڵان و کارو کۆششەکانی لە کوردستاندا

هەرکە حەسەن عەلی خان هاتە کوردستانەوە، دەستیدایە ئاوەدانکردنەوەی ویلایەت و سنوورەکانی. لە سالی ١١٦٤دا (کەریم خانی زەند) پەلاماری کوردستانی داو شاری سنەی تالآنکرد. حەسەن عەلی خانی حاکمی سنە، کە بینی هیچ چاریکی نەماوە لە قەلآی (قەراتبەرە– قراتبرە)دا خۆی قایم کرد. شیخ عەلی خانی زەند بە فەرمانی کەریم خان، گەمارۆی قەلآکەی دا. لەبەر قایمی قەلآکە بۆی نەگیرا، گەرایەوە بۆ لای کەریم خان. سەربازە خراپەکارو شەرئەنگیزەکانی کەریم خان، ئاگریان بەردایە شاری سنەو رۆیشتن.

لە سالی ١١٦٦ی کۆچیدا، (عەلی موراد خانی بەختیاری) لەشکریکی کۆکردەوەو روویکردە کرماشان. (لەم کاتەدا) کەسیکی رەچەلەك نەزانراو، کە ئیدیعای دەکرد کوری شاسولتان حسەینەو ناوی خۆی نابو شاسولتان حسەینی دووەم، لە بەغداوە کەوتبووە داواکاریی تەختی سەلتەنەتی ئیران. (میرزا مەهدی خان)ی میرزای نادرشا، لایەنگری قسەی ئەم (شا سولتان حسەینی دووەم)ەی کردو لەگەلٚ خۆی هینابووی بۆ کرماشان. عەلی مورادخان ئەم شاسولتان حسەینی دووەمە نەناسراوەی کردە داردەستی خۆیو بە مەبەستی گرتنی کوردستان کەوتەرێ. کاتیك کە حسەین عەلی خان بەمەی زانی، لەگەلٚ خەلکی کوردستاندا چوو بۆ پیشوازیی. کەریم خانی زەندیش کە پیشینەیەکی دوژمنایەتی لەگەل عەلی موراد خاندا هەبوو، و هەمیشە لە خەیالی ئەوەدا بوو کە لە ناوییبەریت، ئامادەبوونی حەسەن عەلی خانی بە نوقلآنەی خیر لیکدایەوەو بیئەندازە ریزی لیگرت[٣٤]. هەردوولا بۆ بەرەنگاربوونەوەی عەلی موراد خان کەوتنەرێو لە ناوچەی (بیل ئاوەر– بیل آور)ی کوردستاندا هەردوولا بەیەك گەیشتن. سوپای کوردستان و زەند سەرکەوتن و عەلی موراد خان شکا. هەموو کەلوپەل و چادرو خیوەتەکەی بوو بە نسیبی دلاوەرەکانی زەندو کوردستان. پاشای نەناسراو لەم هەرایەدا کوژرا. حەسەن عەلی خان پاش ئەم سەرکەوتنە دیارو مەزنە گەرایەوە بۆ سنەو کەریم خان چوو بۆ کرماشان.

لـه سـالی ۱۱٦٧دا، کـه (ئـازاد خـانی ئـهفغانی) لـه ئهسـفههان ئـالآی سـهلتهنهتی هەلکرد، حەسەن عەلی خـانی بـانگکرد بـۆ ئەسـفەهان و (سـەلیم پاشـا) نـاویکی کـردە حوکمرانی سنه که خەلکی (ولآتـی) عوسمـانی بـوو، و سـالەها بـوو لـەلای خـۆی لـەناو سوپاکەیدا بوو. پاش دوو مانگ ئازاد خان بری (٤) هەزار تمەنی وەکو دیاری لە سـەلیم پاشا وەرگرت و حەسەن عەلی خانی بە زنجیرکراوی بۆ نـارد. ئـەو نامـەردەش لـە رۆژی گەیشتنی حەسەن عەلی خاندا، لەناوی بردو شەهیدی کرد. پاش کۆتایی هاتنی حەسەن عـەلی خـان مەسـەلەکە تـەواو نـەبوو، خـەلکی ولآت دژی سـەلیم پاشـا راپـەرین و لـە کوردسـتان دەریـانکرد. ئـەمجارە سـەلیم پاشا پـەنای بـردە بـەر (نـواب)[٣٥] محەمـەد حەسەن خانی قاجار، کە لە مازیندەران ئالآی دەسـەلآتگرتنە دەسـتی هـەلکردبوو، بـۆ ئەوەی یارمەتیی بدات دەست بەسەر حکومەتی کوردستاندا بگریت. (خەسرەو خـان)ی کوری (خان ئەحمەد خانی ئەردەلآن) کە سالەها خزمەتگوزاری نواب محەمـەد حەسـەن خانی قاجار بووبوو، و لە سەفەرو مانەوەیدا یاوەری بووبوو، و تەمەنی بە نرخـی خـۆی لەگەڵ ئەو ناودارەدا بەسەربردبوو، باسی نامەردیی سەلیم پاشـاو موسـتەحەقیی خـۆی (بۆ حوکمرانی کوردستان) عەرزی محەمەد حەسەن خانی قاجار دەکات.

بە پیی گیرانەوەی (محەمەد ئاغا)ی باپیری نووسـەر، کـە یـەکیك بـووە لـە هاوەلـە نزیکەکانی خەسرەوخان، محەمەد حەسەن خـانی قاجـار لـە وەلآمـدا پیـی دەلیـت: تـۆ (محەمەد حەسەن)ت باش نەناسیوە. مـن کەسیك نیـم کـە چـاو لـە خزمـەت بپۆشـم و ویلایەت بە کەسیکی بیگانـە بفرۆشـم. دووبـارە دەفـەرمویٚ: خەسـرەوخان، تـۆ سـەرە کەچەلەکـەی (محەمـەد حەسـەن)ت خـراپ ناسـیوە. قسـەی مـن یەکیکـەو خـاوەنی کوردستان تۆی.

بەهەرحاڵ، نواب محەمەد حەسەن خان، سەلیم پاشای لەو خەیالـە نـائومیدو ناکـام کرد، جلوبەرگ و فەرمانی حکومەتی کوردستانی دا بە خەسـرەو خـان و بەدەسـەلآت و سـەنگینی تـەواوەوە نـاردی بـۆ مولکـە میراتیەکـەی خـۆی. خەسـرەوخان لـە

(محەررەمی ١١٦٦)ی کۆچیدا بەرەو مولکی میراتیی خۆی کەوتەرێو بە حوکمی میرات سەرۆکایەتی بەدەستهینا.

## باسی حکومەتی ( خەسرەو خانی گەورە ) لە کوردستانداو ئەو شارو ناوچانەی گرتنی

ئەم خەسرەو خانە پیاویکی عاقڵ و تەگبیرکەر بوو، بیئەندازە ئازاو جوامیر بوو. بە هۆی لیهاتوویی ئەم ناودارەوە، خەلکی کوردستان سامان و توانایەکی کەم وینەیان بەدەستهینا. پتر لە ٣٠ ساڵ بە ناوو ناوبانگیکی بیئەندازە باشەوە، لە لانکەی ئاسایش و هیمنیدا ئیسراحەتیان کرد. بەندە، کە نووسەری ئەم چەند لاپەرەیەم، باسی حوکمرانی خەسرەو خانم بە دریژی لە لاپەرەکانی (میژووی کوردان– تاریخ الاکراد)دا نووسیوە. لەم نامیلکەیەدا لە نیوان دریژەو پوختەدا کورتەیەك دەنووسمەوە.

هەر لەم ساڵەدا کە ساڵی یەکەمی کوردستان بوو (دەبێ مەبەستی لە ساڵی یەکەمی خەسرەوخان لە کوردستان بیت– وەرگیر)، (ئازاد خانی ئەفغانی) لە ترسی کەریم خانی وەکیل (کەریم خانی زەند) و بە هەرەشەی نواب محەمەد حەسەن خانی قاجار ئەسفەهان بەجیدیلێ و بەرەو ئازەربایجان دەروات. لە ریی هەمەدانەوە بە مەبەستی گرتنی کوردستان کەوتەرێ. لە ناکاو گەیشتە دوو فرسەخی شاری سنە. ناچار خەسرەوخان کەوتە قایم کردنی قەڵاو فەرمانی دا سەربازو فەرماندەکان لە هەموو لایەکەوە بین. ئازاد خان (١٢) رۆژ لە دەوری قەڵای سنە بارگەی خست، کاتیك کە لە هەموو لایەکەوە سەربازەکان کۆبوونەوەو روویانکردە شار، ئازاد خان ترس دایگرت و سەرگەردان بەرەو ئازەربایجان هەڵات. خەسرەوخان لە قەڵا هاتەدەرێو تا سەرسنووری گەروس دوایکەوت. ئازاد خانی ئەفغانی باروبارگەی فریداو بەرەو ئازەربایجان هەڵات. باروبارگەی سەربازەکانی ئازاد خان بۆ دلاوەرەکانی کوردستان مایەوە. خەسرەوخان باسی ئەم رووداوەی گیرایەوە بۆ نواب محەمەد حەسەن خانی

قاجار و پیی راگەیاند. لـە لایـەن محەمـەد حەسـەن خانـەوە، بـایی نزیکـەی (٣) هـەزار تمەن ئەسپ و چەك و جلوبەرگ بۆ خەسـرەوخان و دلاوەرانـی کوردسـتان نـیردرا. ئـەم مەسەلەیە بوو بە مایەی رەنجانی کەریم خانی وەکیل. تا لە سالی ١١٧٢ی کۆچی و لـە ناوەراسـتی مـانگی (جـەمادی دووەم– جمـادی الثـانی)دا محەمـەد حەسـەن خـــان بـــە خەنجـەری (عـەلی ئەسـتەر ئابـادیی) نـاویك و (محەمـــەد عـــەلی ئاغـــای دولـــو) پیکـــراو شەهیدکراو، ئەم هەواڵە سامناکە گەیشتە خەسرەوخان. خەسرەوخان لە ترسـی کـەریم خان، کەوتە کۆکردنەوەی سوپاو قایمکردنی شوین و جیگەی خۆی. (بەڵام) کـاتیك کـە هەواڵە سامناکە کە گەیشتە کەریم خانی وەکیل، جلوبـەرگی سـەرۆکایەتی کوردسـتانی نارد بۆ خەسرەوخان و، لە ریگەی دلنەوایی کردنی جۆراو جۆرەوە ئاسوودەی کـرد. لـە سالی ١١٧٣دا کەژاوەی کەریم خان لە تارانەوە روویکـردە (چیمـەنی سـولتانیە– چمـن سـلطانیە). خەسـرەوخان ئەحمـەد خـانی کـوری بـە دەسـتودیاری نایـاب و شایسـتەی شایانەوە، ناردە خزمەتی کەریم خانی وەکیل.

لە سالی ١١٧٦ی کۆچیـدا (سـلیمان پاشـای بابـان) بـە نیـازی گرتنـی کوردسـتان، پەلاماری مەریوانی دا. کە خەسرەوخان بە نیازی سلیمان پاشـای بابـانی زانـی، لەگـەڵ کۆمەلیکی کەمدا چوو بەرەو پـیری. لـە دەشـتی مـەریواندا هـەردوولا بەیـەك گەیشـتن. سـلیمان پاشـا شـکاو خەسـرەوخان سـەرکەوت. سـلیمان پاشـا، کـە لـە بەرامبـەر خەسرەوخان و دلاوەرانی کوردستاندا تیکشکابوو، بۆ تۆلەسەندنەوە چوو بـۆ دەربـاری کـەریم خـانی وەکیـل. فروفیلـی زۆری خسـتەکار، تۆمـەتی جۆراوجـۆری خسـتەپاڵ خەسرەوخان و نزیکەی (٣٠) هەزار تمـەن پـارەی زیـری پیشکەشـی کـەریم خـان کـرد. کەریم خانی وەکیلیش کە کۆنە قینیکی لە خەسرەوخان هەبوو، بانگی کرد بـۆ شـیراز. پاش ئەوەی خەسرەوخان چوو بۆ شیراز (کەریم خان) دەسەڵاتی لیسەندەوەو سـلیمان پاشای کردە حوکمرانی کوردسـتان. سـلیمان پاشـا بـە جلوبـەرگ و فەرمانـەوە بـەرەو کوردستان کەوتەرێ.

پاش سالیك سلیمان پاشا له پیخەفی نوستندا، به دەستی (فەقێ ئیـبراهیم) نـاویك کوژرا. به فەرمانی کەریم خانی وەکیـل، (محەمـەد پاشـا)ی بـرای لـە سـلیمانی بـوو بـە جینشینیو، (عەلی خان)ی کوریشی لە سنە بوو بە حوکمران.

پـاش تیپـەرینی دوو سـاڵ و لـە سـالی ١١٧٩دا، بـە فـەرمانی کـەریم خـان دوبــارە خەسرەوخان بوو بە والی ویلایـەتی کوردسـتان و، بـە جلوبـەرگ و فەرمانـەوە هـات بـۆ کوردستان و لەوپەری سـەربەخۆییدا کەوتـە فـەرمانرەوایی. هـەول و کۆششـیکی زۆری کرد بۆ ئاوەدانکردنــەوەو چاکردنـەوەی شـاری سـنەو قـەلای حکومـەت. بناغـەی بینـاو دیوەخانیکی روو لە خۆرهەڵاتی داناو تەواویکردو ناوی لینرا (خەسـرەوییە). ئیسـتا کـە سالی ١٣٠٩ی کۆچییە، ئەم بینایە بەوپەری پتەویەوە وەکو خۆی ماوەتەوە. (محەمــەد ئیـبراهیم خـانی نـوری نیزامولدەولـە –نظـام الدولـە)، کـە لــە سـالی ١٣٠٦ی کۆچیـدا حوکمرانی کوردستان بوو، دەستیکی بە دیوەخانی ئەم بینای خەسرەوییەیەدا هینا.

بەهەرحاڵ، خەسرەوخان لە حکومەتەکەی خۆیدا هیزی پەیداکردو، لەناو میرەکـانی ئیراندا بە شانوشەوکەت و بەهیزی ناوبـانگی دەرکـرد. پـاش ئـەوەی لـە سـالی ١١٩٣ی کۆچیـدا کـەریم خـان کۆچـی دوایـی کـرد، (جەسـتەی) مەملەکـەتی ئـیران بــی رۆحــی سولتانیکی بە توانا مایـەوە. هەرکەسـەو لـە سـووچیکەوە سـەری بـەرزکردەوەو داوای سەروەری دەکردو لافی سەربەخۆیی لیدەدا. لە هەمان سالێ ١١٩٣دا، (ئەللا قولیخـانی زەنگەنە) هەوای بە دەستهینانی سەلتەنەت لیـی داو قۆزاخـەی خامۆشـیی درانـد. یـەك دڵ و یـەك بـروا نزیکـەی (٢٠) هـەزار سـوارو پیـادەی لـە تیرەکـانی زەنگەنـەو کـەلهورو خیلەکانی سەر ریی هاتوچۆی سنووری خاکی عوسمانی ئامادەکردو پیـی وابـوو گرتنـی کوردستان دەرگای جیهانگیری لەسەردەکاتەوە. لـە ریـی (سـەحنە–کـەنگاور– صحنـە کنگـاور)ەوە روویکـردە کوردسـتان. (محەمـەد رەشـید بـەگی وەکیلـی کوردسـتان) کـە ماوەیـەك لەوەوبـەر لەگـەڵ دەسـتوپیوەندەکانی خۆیـدا چووبـوو بــۆ کرماشــان، لــەم سەفەرەدا یاوەرو راویژکاری بارەگای ئـەللا قولیخـان بـوو. کـە هـەوالی بزووتنەوەکـەی

ئەللاّ قولیخان بە خەسرەو خان گەیشت، بی دواکەوتن و سلکردنەوە بـەو سـوپاکەمەوە کە لە شاری سنەدا لەبەردەستیدا بوو، دەرچوو و گەیشتە ملـەی (باخـان– باغـان) کـە سێ فرسەخ لە شارەوە دوورەو بیجگە لە ریگەیەکی باریك هیچ ریگەیەکی بۆ تیپەرینی سەربازەکان تیدا نـەبوو، بـە منـی گـوت لـە سـوچیکدا دانیشـەو سـوارەو سـەربازەکانم بژمیرە بزانین چەندن. منیـش بـە پیـی فـەرمانی خەسـرەوخان لـە سـوچیکدا دانیشـتم (مەبەست لە من، محەمەد ئاغایە– نووسەر). ژمارەی سوارە گەیشتە (٧٤٠). بەلاّم هەر هـەموو ئـەم سـوارانە لـە وەجاخزادەکـانی مەملەکـەت و تـیرە ناودارەکـانی کوردسـتان بوون. کە چوومە لای خەسرەوخان و پیم راگەیاند، بە دلیکی هوشیارو بە گورەوە ئـەم ئایەتە پیرۆزەی خویندەوە: (و کم من فئة قلیلة غلبت فئة کثیرة بـاذن الله). ئینجـا هـەر لەویدا خەسرەوخان سوپاکەی خۆی لە نیوان حەوت کورەکەی خۆیـدا دابەشـکرد. هـەر یەکەیانی کردە سەرداری (فەرماندەی) ١٠٠ سوار. چل سوارەکەی تریشی لەگەلّ خۆیـدا هیشتەوەو کردنی بە سوارەی تایبەتی خۆی هەر خۆیشی فـەرماندەیی گشـتیانی گرتـە ئەستۆو زۆر بـە پەلـە کەوتـەرێ. هـەر لـەویوە (خـان ئەحمـەد خـان)ی کـورە گـەورەی لەگەلّ (میرزا یوسفخانی وەزیر)دا کردە پیشقەراولّ. لەولایشەوە ئەللاّ قولیخان نزیکـەی هەزار کەسی لە خیلی زەنگەنەو ئەو کوردستانیانەی لەناو سـوپاکەیدا بـوون هـەلبژاردو کردنی بە پیشقەراول و یەك فرسەخ لە پیش سوپاکەیەوە رەوانەی کـردن. بـە ریکـەوت لە نیوەی شەودا پیشقەراولاّنی هەردوولا بەریەککەوتن. خان ئەحمەد خان وەکو شـیری بیشە پەلاماری دەدا، بریندااری دەکرد، دیلی دەگرت و دەیکوشت. مـیرزا یوسـفیش کـە خاوەنی شمشیرو قەلـەم بـوو وەکـو رۆسـتەمی داسـتان بـە شمشـیرو بـە چنـگ و ددان کەوتە پەلامار. گەلیکیان پیکاو گەلیکی تریان گرت. پاشمـاوەی سـوارەی زەنگەنـە لـە ترساندا رایانکردو بەرەو سوپاکەی ئـەللاّ قولیخـان هـەلاّتن. بەرەبـەیان، خـان ئەحمـەد خان بەدیل و دەسکەوت و تالاّنییەکی بیئەندازەوە گەرایەوە خزمەت باوکی خانەدانیو، دەسخۆشیو ئافەرینی پیبرا. بەهەرحالّ، کاتیك کە خۆر لە خۆرهەلاّتەوە سەریدەرهینا،

به فەرمانی خەسرەو خانی والی، سـوارەی کوردسـتان زریـی بریقـەدار لەبـەر، یەکـە بـە یەکە وەکو شیری برسی لە بالی راست و بالی چەپدا ریزبوون و، خەسرەو خانی والیش چـووە نـاوەندەوە (قلـب). لەولایشـەوە، ئـەللا قولیخـان کەوتـە ریکخسـتنی ریزەکـانی سوپاکەی خۆیو، بـە پیـی بنـەماکانی ئامـادەکردنی سـوپا، چـەپ و راسـت و نـاوەندو بالـەکانی ریکخسـت. تۆپخانـــەو (زەنبـــورەك خانـــە)[٣٦]ی لەهـــەر دوو بـــال و نـــاوەندا دامەزراند. بە چاوی سووك تەماشـای ئـەم سـوپا بچووکـەی کوردسـتانی دەکـرد. خـان ئەحمـەد خـانی کـورە گـەورەی خەسـرەوخان، پیشـنیاری کـرد خۆیـان لـە شـــەرکردن دوابخەن، بۆ ئەوەی سەربازەکانی ئەللا قولیخـان سـەریان لیبشـیویٔ و بینـە پیشـەوە. رەنگە ئەوسا واز لە تۆپخانە بینن و بینە مەیدانی نەبەردەوە. وا ریکەوت ئـەم تـەگبیرە جیبەجی کرا. کە ئەللا قولیخان سیستمی سوپای کوردستانی بینی، بە راویژو رینمـایی محەمەد رەشید بەگی وەکیلی کوردستان، فەرمانی دا بە دوو هـەزار سـوار لـە تایەفـەی کەلهور و زەنگەنە، پەلاماری سوپای کوردستان بدەن و لـە جیـی خۆیـان هەلیانکـەنن. سوارەی کەلهورو زەنگەنە بیٔ دواکەوتن پەلاماریان دان. لـەملاوە، کـاتیك کـە (سـوپای کوردستان) بینییان شەرەکە بە پیی ویستی ئـەوان دەروات، خەسـرەوخان فـەرمانی دا بـە خـان ئەحمـەد خـان و (ئـــەمیر ئەرســـەلان) و (محەمـــەد خـــان)، کـــە هەرســـیکیان جگەرگۆشەی ئەو ناوداره بوون، لەگەلٔ سوارەکانی خۆیاندا بچنە مـەیدانی نەبـەردەوەو پـەلاماریان بـدەن. خـان ئەحمـەد خـان و براکـانی وەکـو شـیری نـەرو پلنگـــی تـــوورە هیرشیان بۆ بردن و لەم یەکەم هیرشەدا تیکیانشکاندن. سـەربازەکانی ئـەللا قولیخـان، کە ئەم دلیرییەیان بینی، بیدواکەوتن دەستیان لە شەر هەلگرت و ریی هـەلاتنیان گرتـە بەر. دەستەکانی تری سەربازەکانی خەسرەوخان، کەوتنـە هـیرش و پـەلامارو چـەندین تەپۆلکەیان لە لاشەی کوژراوەکان دروستکرد. لەم هەرایـەدا (رەزا بـەگ) نـاویك کـە لـە تایەفەی کەلهور بوو، و جلەوداری تایبەتی خەسـرەوخان بـوو، تووشـی ئـەللا قولیخـان دەبیٔو وەکو مـەر سـەریدەبریت. محەمـەد ئاغـای باپـیری نووسـەر دەلیـت: کـاتیك کـە

سوپای کوردستان کەوتنــە شـوینکەوتن و کوشـتن و گرتـن و تـالانکردن، خەسـرەوخان چووە ناو پەردە سەرای ئـەللا قولیخانـەوە، کـە چـادرو خیوەتـە سـەلتەنەتیەکەی بـوو (واتەهی ئەللا قولیخـان) و بیجگـە لـە مـن کەسـی لەگـەلدا نـەبوو. کـە ئـەو چـووە نـاو خیوەتەکەوە، مــن چوومـە سـندوقخانەی خیوەتەکـەو ژمارەیـەکی زۆر سـندوقم بینـی. سەری یەکیکیانم هەلدایەوە، بینیم پرە لە کەلوپــەلی سـەلتەنەت. قوتوویـەکی تیدابـوو، هەلمگرت و خستمە گیرفانم. پاشان چووم بۆ لای خەسرەوخان، کە بیزارو ماندوو لــەناو خیوەتەکەدا راکشابوو. لیی پرسیم لە نیعمەتی خودا هیچـت دەسـکەوت؟ مـن یەکسـەر عەرزم کرد: (مـن دوای گـەورەم کـەوتبووم، لەبـەر خزمـەت فریـای نیعمـەت نەکـەوتم). پاشـان مەسـەلەی سـندوقە بچکۆلەکـەم باسـکرد. خەسـرەوخان کــە ئــەم چیرۆکــەی بەرگویکەوت، لە جیی خۆی هەستاو داوای سندوقە بچکۆلەکەی کرد. ویستم بیشــکینم، نەیهیشت. مۆرەکەی خۆی لە گیرفانی دەرهینا، پەتی مۆرەکە کلیلیکی بچووکــی پیـوە بوو. هەرکە کردی بە قفلەکەدا، کرایەوە. فـەرمووی (سـوبحانەللا، ئـەمرۆ تـاج رادەیـەك سـەرکەوتن یـاوەری ئیمەیـەو گریکانمـان بـۆ دەکریتـەوە ! کلیلـی ئیمـە، قفلــی ئــەوان دەکاتەوە !). کە سەری سندوقە بچووکەکـەی کـردەوە، بینـی پـرە لـە دوڕو گەوهــەری جۆراوجۆر. هەمووی هەلرشتە سەر فەرشی خیوەتەکە. من کە ئەوانەم بینــی شـلەژام و واقم ورما. پەشیمان بوومــەوە لـەوەی سـندوقەکەم ئاشـکرا کردبـوو. خەسـرەوخان بـە دارەکـەی دەسـتی گەوهـەرەکانی تیکداو بلاویکردنـەوە. ئەنگوسـتیلەیەکی پیرۆزەیـان تیدابـوو، کردیـە پەنجـەی و گوتــی ئەمانــە هــەلگرە، بــە دیــاری بیانبــەوە بــۆ ژن و مندالەکانت. چونکە بە کەلکی ژنان دیـن. نرخـی ئـەم گەوهەرانـە لـە (٥٠) هـەزار تمـەن پتر بوو.

بەهەرحالّ، تۆپخانەو (زەنبورەکخانە) و شتومەکی سەلتەنەتیو کەلوپــەل و چـادرو خیوەتیکی لە ئەندازە بەدەر دەبیت بە نسـیبی خـەلکی کوردسـتان. (محەمـەد رەشـید بەگ)یش لەگەلّ (نەسـیر بـەگی کولیـایی) و کۆمـەلیك لـە گـەورەپیاوانی یـاوەری ئـەللا

قولیخاندا دەستگیر دەکرین و بە دیل دەگیرین. کاتیك کە محەمــەد رەشـید بـەگیان بـە دەستبەستراوی هینایە لای خەسرەوخان، لە رووی ئەوپەری دادپەروەریو گەورەییەوە کە شایستەی خۆی بوون، کۆت و بەندەکانی کردەوەو پییگوت: "وەکیل (از هرچـە کـە بگزری سخن دوست خوشـتر اسـت)[37]، شـیلم و سـاوەرەکەی کوردسـتانی خۆمـان لـە خۆراکـە رەنگاورەنگـەکانی کرماشـان خۆشـترە". فەرمانیشـی دا هــەرچی کەلوپــەل و شـتومەك و ئەسـپ و داراییـەکی محەمـەد رەشـید بـەگ بـە تــالان برابــوو، هــەموویان کۆکردەوەو دایانەوە بە خۆی.. هتد.

خەسرەو خان پاش ئەم سەرکەوتنە دیارو مەزنە، (حاجی عەلی خان)ی مـامی ئـەڵلا قولیخـانی کـوژراو دەکاتـە حوکمرانـی کرماشـان. حـاجی عـەلی خـانیش (خەزینــەکان، گەنجینـە شـاردراوەکان، رەوە میگـەل و.. هتـد)ی ئـەڵلا قولیخـان بـە فەرمانبـەرەکانی دەسپیریت. خەسرەو خان هەموو دەسکەوتەکانی ئـەو سـەفەرە لـە پـارەو کەلوپـەل و شتی تر، کە بایی پتر لە چوار کرور[38] بووە بـە پـارەی ئیسـتا، بەسـەر سـەربازەکانی خۆیدا دابەشدەکات، بیجگـە لـە ئەسـپ و چـادرو خیوەتەکـەی ئـەڵلا قولیخـان، تـەماع ناکاتە هیچ شتیك و بەوپەری سەربەرزیو شانازییەوە گەرایەوە بۆ سنە. هەموو خەلکی کوردستان لە والی تا ئەهالی، ماوەیەك بە خۆشیو شادی رۆژگار بەسـەردەبەن. شـایانی باسە هیچ یەکیك لە میژوونووسەکانی ئـەم دەولەتـە هەمیشـە بەرقـەرارو پایـەدارە، بـە هیچ جۆریـك باسـی ئـەم ئـەڵلا قولیخانـە، شـەرەکەی لەگـەڵ خەسـرەوخان و (پاشـان) کوژرانی ناوبراویان نـەکردووە. ئەمـە لـە کاتیکدایـە کـە هیـچ گومـانیك لـەوەدا نیـە کـە هەبووەو شەری لەگەڵ خەسرەو خاندا کردووە. بەندە کە دانەری ئەم چەند لاپەرەیەم، پـتر لـە (٣٠) کەسـم دیـوە کـە خۆیــان لــەم شــەرەدا ئامــادەبوون. ئــەم شــەرە لــە (رەبیعولئـەوەلی ١١٩٣)دا روویـداوە، کـە دەکاتـە مـانگیك دوای مردنـی کـەریم خــان و، لەبەرئــەوەی ســەرەتای شــۆرش و گۆرانــەکان بــووە، کــەس تۆمــاری نــــەکردووەو نەینووسیوەتەوە.

له سالی ١٢٠٠ی کۆچیدا (جەعفەر خانی زەند) کە داوای تەختی سەلتەنەتی ئـێرانی دەکرد، بە مەبەستی راکیشانی خەسرەوخان بەلای خۆیدا، لـە ئەسفەهانەوە هـات بـۆ شاری هەمەدان. چونکە لەودەمەدا، خەسرەوخانی والیی کوردستان لـە رووی ژمـارەی سەربازو پالەوانانەوە، لە سەرووی هەموو میرەکانی ئیرانەوە بـوو. لەبەرئـەوە جەعفـەر خانی زەند بە ناردنی نامــەو پەیامبـەر بـەرەو لای خـۆی بانگهیشـتیکرد. خەسـرەوخان راویژیکــی زۆری بــە گــەورەپیاوانی مەملکەتەکــەی کــرد. لەســــەر پشــــتگیریکردن و دژایەتیکردنی قسە زۆر کرا. سەرەنجام هەموو راکان لەسەر ئەوە یەکیانگرت کە شــەری لەگەلدا بکـەن. بۆیـە رۆژی دوایـی خەسـرەوخان بیدواکـەوتن بریـاری دا بـە لەشـکریکی گـەورەوە بچیـت بـۆ شـەری جەعفـەر خـان. (خەسـرەوی بــەختیار) بــەرەو هەمــەدان کەوتەرێو (محەمەد حسـین خـانی قـەرەگوزلو) و (خانـەکانی گـەروس) و (عـەلی خـانی خەمسە)یشی بانگهیشتکرد بۆ ئەم نەبەردە. ئەم سەرکردانە بە پینـج هـەزار سـوارەوە، لە نزیـك گونـدی (بـەهار)ی هەمـەدان، چوونـە پـاڵ سـوپاکەی خەسـرەوخان. بـۆ رۆژی دوایـی، کـە ریکـەوتی پینـج شـەممە (٢٤ی شـەعبانی ١٢٠٠ی کۆچـی) بـوو، لـە گونـدی بەهاری هەمەداندا شەریکی سەختیان لەگەڵ جەعفەر خاندا کرد. دەمەو خۆرئـاوابوونی رۆژی یەکەمی شــەر، هـەردوولا بیسـەرکەوتن و شکسـت دەسـتیان لـە شـەر هـەلگرت و گەرانەوە بـۆ شـوینی حەوانـەوەی خۆیـان. لـە پـیش نیـوەرۆی رۆژی دووەمـی شـەردا، سوپای عـەلی خـانی خەمسـەو محەمـەد حسـین خـانی قـەرەگوزلو شـکان و پەرتـەوازە بوون. خەسرەوخانی والیی کوردستان لەگەڵ سـوپا هەمیشـە سـەرکەوتووەکەیدا، وەك کیو لە شوینی خۆیان نەجووڵان. خەسرەو خان لەگەڵ سێ کوری خۆیو هەزار سوار لە سـەرکردەکانی کـورددا، وەکـو شـیری نـەر چوونــە مــەیدان و نەبــەردیکی ســەختیان بەرپاکرد. بیباکانە هیرشیان برد، سـوپای جەعفـەر خـان تیکشـکا. ژمارەیـەکی زۆر لـە سوپای زەند کوژرا. جەعفەرخان کە پیاویکی کەتەو بە هەیکەل بوو، توانای هەڵاتنی لە خۆیدا نەدیو پەنای بردە بـەر سـەنگەری تۆپخانەکـەی خـۆی. سـوارەکان چـواردەوری

سەنگەرو تۆپخانەکـەیان گـرت و ئابلوقـەیان دا. خەسـرەو خـانی والی، کۆمـەلیك کـوری ئازای نارده ناو سـەنگەرەکەوه بـۆ ئـەوەی پاریزگـاری لـە جەعفـەرخان بکـەن. هـەموو کەلوپەلی سەلتەنەتی جەعفەر خان و سوپاکەی بوون بە نسیبی دلیرانی کوردستان.

لەم شەرەدا (١٣٠٠) کەس لە خەلکی فارس (شیراز) و زەند کـوژران و (٨٠٠) کـەس بە دیل گیران. ژمارەی بریندارو کوژراوی کوردستان گەشتبووە (٣٤٤) کەس.

بەهەرحالْ، شەو جەعفەر خـان لـە ریگـەی یـەکیك لـە (موجتـەهید–مجتـهد)ەکـانی هەمەدانەوە، خشلْو گەوهـەرەکانی خـۆی لەگـەلْ بـەرگیك قورئـانی پـیرۆزدا نـارده لای خەسـرەو خـان و تکـای لیکـرد ئـازادی بکـات. خەسـرەو خـانیش کـە خـاوەنی دلیکـی بەخشندەو دەروونیکی بە بەزەیی بوو، بۆ سەرۆکی تۆپخانـەی جەعفـەر خـانی نووسـی کە جەعفەر خان و سیان لە کەسوکاری ئازاد بکـات و ریگـەیان بـدات بـۆ کـوێ دەچـن، بچن. جەعفـەر خـان بـەو شـەوە تاریکـە لەگـەلْ سـێ کەسـی خۆیـدا بـەرەو ئەسـفەهان کەوتەرێ. دەلین لە هەمەدانەوە بە یەك غار گەیشتە شاری ئەسفەهان.

خەسرەوخان پاش گرتنی هەمەدان و چارکردنی جەعفەر خان، لە گرتنی (مەلایر) و (تویسـەرکان) و (کـەزاز) و (فـەرهان) و (گولپایـەگان)دا دلـیریو جوامـیری نوانـدو لـە ماوەی چەند رۆژدا هەموو ئەم ویلایەتانەی گرت. کـە گەیشـتە گولپایـەگان، دوو– سـێ رۆژیـك بـۆ حەوانـەوەی لەشـکرەکەی لـەوێ مایـەوە. شـەویك خەسـرەوخانی والی بـە (جەعفـەر بـەگ) کـە (تـەرخان– ترخـان)[٣٩]ی مەجلیسـی خـۆی بـووە، دەلیـت: ئـەم سەلتەنەتەمان چۆن دەبینی؟ جەعفەر بەگ دەلیـت: خـانی (یـاخود گـەورەی) شـیلم و ساوەر خۆرەکان لەم سەلتەنەتە باشترە. ئەم قسەیە کاری کردەسەر خەسـرەو خـان و بۆ بەیانی، دیلەکانی سوپای زەندو گیراوەکانی ترو، ئەو خشلْ و گەوهەره سولتانیانەی لە جەعفەر خانی گرتبوو، لەگەلْ عەریزەیەکی نۆکەریدا، نارد بـۆ حـەزرەتی شـەهریاری قاجار (ئاغا محەمەد خان)[٤٠]و خۆی بەرەو کوردستان گەرایەوە. شـەهریاری قاجـار بـە بیستنی ئەم هەواله بیئەندازه خۆشحال بوو. چونکە شکستی دوژمنیکی وەکو جەعفـەر

خان و ملکەچکردنی خەسرەوخانی والیی دەگەیاند کە کاریکی زۆر گەورە بوو، و لە راستیدا هەلهاتنی خۆری بەختی ئەو پاشا بیهاوتایە، هەر لەم مەسەلەیەوە دەرکەوت. بۆیە ئەسپیکی عەرەبیی بە زینیکی رازاوە بە زیرو گەوهەرەوە، لەگەڵ پشتین و خەنجەری ئەلماس و دەستیك جلوبەرگی شاهانەدا، نارد بۆ خەسرەو خان. فەرمانیکیشی سەبارەت بە ستایش و پیرۆزبایی ئەم سەرکەوتنەو سپاردنی ویلایەتەکانی (سونقور) و (کولیایی) بە خەسرەوخان، دەرکرد. نیردراوی والیشی بە جلوبەرگ و دیاری زۆر خەلاتکردو رەوانەی لای خەسرەو خانی کردەوە.

بەهەرحاڵ، پاش ئەوەی ئاغا محەمەد خان لەسەر تەختی پاشایەتی ئیران دانیشت، ئەم شەهریارەی قاجار دوو سێ جار خەسرەو خانی بانگهیشت کردە دەرباری خۆی. خەسرەو خان پۆزشی دەهینایەوە. تا لە سالی ١٢٠٣ی کۆچیدا خان ئەحمەد خانی کوری بوو بە جیگریو خەسرەو خان خۆی روویکردە دەرباری ئاغا محەمەد خانی قاجار. بە گەیشتنی بۆ تاران، لە ترس و سامدا تووشی نەخۆشی پەرکەم و وەسواسی بوو. حەکیمەکان چەند هەولیاندا چارەسەری بکەن، سوودی نەبوو. لەم بەینەدا، خان ئەحمەد خانی کوری کە جیگیر بوو لە کوردستاندا، دەستیدابووە کوشتن و برینی تایەفەی موکریو بلباس. پاش سەرکوتکردنیان، لە کاتی گەرانەوەیدا لە ناکاو بە دەستی یەکیك لە نارازییەکانی سوپاکەی خۆی کوژرا. گەیشتنی ئەم هەواڵە بە خەسرەوخان، ئەوەندەی تر نەخۆشیەکەی لی پیسکردو بە تەواوی عەقلی لە دەستدا. بە پیی فەرمانی پاشا، (لوتفعەلی خان)ی مامی خەسرەوخان، کە پیاویکی عاقڵ و دلیریکی رەشیدو دانا بوو، لە سالی ١٢٠٤ی کۆچیدا حکومەتی کوردستانی پیبرا. خەسرەو خان هەر بەو حالەتی شیتییەوە لە ئەسفەهان دەژیا، تا لە سالی ١٢٠٦ی کۆچیدا ئەم دنیا فانییەی بەجیهیشت و گواستیانەوە بۆ شوینە پیرۆزەکان. ماوەی حوکمرانی خەسرەو خان ٣٣ ساڵ بوو.

## باسی حکومەتی ( لوتفعەلی خان )ی مامی خەسرەو خانی گەورە لە کوردستان

لە هەمان سالدا کە ١٢٠٦ی کۆچی بوو، بـە فـەرمانی حـەزرەتی شـەهریاری قاجـار، لوتفعـەلی خـان بـە سـەرداری (وەکـو فـەرماندە) نـیردرا بۆخۆزسـتان.ئـەو ناوچەیـەی پاککردەوەو سەرکیشەکانی لەناوبرد، کۆمەلیك لە سەرکردەکانی ئەو ناوچەیەی لەگـەڵ دیاری شایستەدا نارد بۆ دەرباری شەهریاری قاجارو خۆی گەرایەوە بۆ کوردسـتان. لـە سالی ١٢٠٨ی کۆچیدا دیسان خـەلکی خۆزسـتان یـاخیبوون. ئـەمجارەیان بـە فـەرمانی شەهریاری قاجار (حەسەن عەلی خان)ی کـوری لوتفعـەلی خـان، کـە لـە دەربـاری شـادا نیشتەجیبوو، کرایە سەرداری خۆزستان. لەگـەڵ لەشـکری کوردسـتاندا روویکـردە ئـەو ناوچەیە، لە ماوەیەکی کەمدا ئارامی گیرایەوە بۆ ناوچەکەو بـە کـامی دل گەرایـەوە بـۆ دەرباری پاشای قاجار.

لە مانگی (شەوال)ی ١٢٠٩ی کۆچیدا لوتفعەلی خان بە مەرگیکی کتوپر مرد. ماوەی حوکمرانی لوتفعەلی خان (٦) ساڵ بوو. کە هەوالی لوتفعـەلی خـان گەیشـتە شـەهریاری قاجار، حەسەن عەلی خانی کوری لوتفعەلی خانی لە جیی نارد بۆ حکومەتی کوردستان، کە لە دەرباری خۆیدا ئامادەبوو.

## باسی حوکمرانی ( حەسەن عەلی خان )ی کوری لوتفعەلی خان لە کوردستاندا

ئەم حەسەن عەلی خانە لە رۆژانی حوکمـی خۆیـدا، بـە شـیوەی زاهیـدو عابیدەکـان رەفتاری دەکردو خزمەت و خیانەت لەلای وەك یەك بـوون. شـەوو رۆژ ی بـە راووشـکار دەبردە سەر، یاخود لـە کونجـی گۆشـەگیریدا خـەریکی عیبـادەت و خواپەرسـتی بـوو. دەسەڵاتی حوکمرانی ویلایەتەکەی سپاردبوو بە یەکیك لـە خزمـەتکارەکانی خـۆی. دوو ساڵ بەم شیوەیە رۆژگاری بردە سەر. تا لە سالی ١٢١١ی کۆچیـدا بـە فـەرمانی پاشـا،

لەگـەڵ (٥٠٠) سـواردا لـە هـەموو خێلـەکانی کوردسـتان خۆیگـەیاندە کــەژاوەی شــا، کەبـەرەو ئازەربایجــانی قــەرەباغ و (شــوش) تــا (تــەفلیس) دەرۆیشــت. (ســوبحان ویردیخان)یش کە یەکێك بوو لە ئامۆزاکانی حەسەن عەلی خان، کۆمەڵێك لە پیاوماقوول و گەورەپیاوانی کوردستانی لەگەڵ خۆیدا بردو بە مەبەستی شکایەتکردن لـە حەسـەن عەلی خان روویکردە کەژاوەی شـەهریاری قاجـار. تـا لـە قـەڵای (پـەنا ئابـاد)دا کـە بـە (شیشە فەقەرە) بەناوبانگە، شەهریاری قاجـار کـوژرا، سـوپای دەوڵـەتی پـەرت و بـڵاو بوونـەوەو هـەر دەسـتەیەی روویکـردە لایــەك. کوردســتانیەکانیش، هەریەکــە لەگــەڵ دەستەی خۆیدا، بەرەو کوردسـتان گەرانـەوە. سـوبحان ویردیخـان چـەند رۆژێـك پـێش حەسەن عەلی خان گەیشتە سنەو خۆی کردە حاکم. پاش تێپەرینی (٧-٨) رۆژ بەسەر حکومەتەکەیدا، حەسەن عەلی خان لەگەڵ سوارەی کوردستاندا گەیشتنە نزیکـی سـنە. کە سوبحان ویردیخان بە هاتنی حەسەن عەلی خـانی زانـی، بیدواکـەوتن بـەرەو موڵکـی بابان هەڵات.

لـە (زیلحەجـە)ی ١٢١٢ی کۆچیـدا، سـێ مــانگ پــاش ئــەوەی شــەهریاری ئــێران (فەتحعەلی خـانی قاجـار) چـووە سـەر تـەختی پاشـایەتی ئـێران، سـوبحان ویردیخـان، (ئەمانەڵڵا خان)ی کوری خەسرەو خانی والیــی بـە ٢٠ هـەزار تمـەن زێـرەوە نـاردە (دار الخلافە)ی تاران، بۆ ئەوەی فەرمان و جلوبەرگی حوکمرانی کوردسـتانی بـۆ بێنێتـەوە. ئەمانەڵڵا خان لە (محەرەم)ی ١٢١٣دا گەیشتە تاران و چــووە مـاڵی (مـیرزا ئەحمـەد)ی وەزیری کوردستان، کە ئەوکاتە خەزنەداری دیوان بوو. مەسەلەکەی لای میرزا ئەحمــەد باسکرد. میرزا ئەحمــەد بـە ئەمانـەڵڵا خـانی گـوت: لـە رووی میراتییـەوە تـۆ خـۆت لـە هەمووان خاوەن حەقتری بۆ سەرۆکایەتی کوردستان. هــەر ئـەم پـارە زێـرە پیشـکەش حوزووری شاهەنشای قاجار بکـەو حکومـەت بـۆ خـۆت وەربگـرە. ئەمانـەڵڵا خـان ئـەم رایەی پەسەند کردو بە هۆی مـیرزا ئەحمـەدەوە چوونـە لای (حـاجی ئیـبراهیم خـان)ی (سەدری ئەعزەم) و، دریژەی رووداوەکانیان بۆ باسکرد. سەدری ئــەعزەم مەسـەلەکەی

قبولكرد. بەڵام لەبەرئەوەی کەژاوەی شەهریار (کەژاوەی شاهانە) لەسەر رۆیشتن بوو بۆ گرتنی خوراسان، جیبەجیکردنی ئیشەکەیان خستە دوای گەرانەوە لە سەفەری خوراسان. بەهەرحاڵ، پاش گەرانەوە لە سەفەری خوراسان و ریکخستنی ئەو ناوچەیە، لە مانگی (صفر المظفر)ی ١٢١٤ی کۆچیدا، حەسەن عەلیخان لە ئەنباری دەولەتدا بەندکراو ئەمانەللا خانی کوری خەسرەو خان کرا بە حوکمرانی کوردستان. ماوەی حوکمرانی حەسەن عەلی خان چوار سالی تەواو بوو.

## باسی حکومەتی ئەمانەللا خانی گەورەو ئەو بینایانەی دروستیکردن

پاش ئەوەی ئەمانەللا خان هات بۆ کوردستان، بە گورو ئیرادەیەکی بەهیزەوە دەستیکرد بە فەرمانرەوایی لە کوردستاندا، ئەم ئەمانەللا خانە کە ئیستا بە ئەمانەللا خانی گەورە بەناوبانگە، خاوەنی خوو و رەوشتی بەرز، رای دروست، بیری تیژو خەیالی فراوان بوو. سەرکیشەکانی لەناوبردو دوژمنانی ریشەکیش کرد (وینەی دلاوەران بە نەخش و نیگاری سەر دەرو دیواری پاشماوە رووخاوەکانەوە دیارە).

هەروەها دەستیدایە چاکردنەوەی قەلای حکومەت و تەواوی کرد. دروستکردنی مزگەوتی (دارالاحسان) کە ئیستا ماوە، بەلگەیەکی دیارو سەلمینەری گەورەیی ئیرادەو دانایی‌و هوشیاری ئەوە. لە باسی بیناکانی شاری سنەدا کە لە سەرەتای ئەم کتیبەدایە، کورتەیەك سەبارەت بە بیناکانی ئەم میرە بە دەسەلاتە باسکرا، لەوەش زیاتر لە شیوەی میژوونووسین دەچیتە دەرەوە.

پاش تیپەرینی دوو ساڵ بەسەر حکومەتی ئەمانەللا خاندا، حەسەن عەلی خان لە عەماری شا رایکردو پەنای بردە بەر عەشیرەتی بلباس. بە مەبەستی شەر لەگەڵ ئەمانەللاخان و گرتنی کوردستان، کۆمەلیك لە عەشیرەتی بلباسی لەگەڵ خۆیدا ریکخست و پەلاماری کوردستانی دا. ئەمانەللا خان بە سوپایەکی کەمەوە چوو بۆ پیشوازی. لە کەناری دەریاچەی مەریواندا هەردوولا بەیەکگەیشتن حەسەن عەلی خان

بریندار بوو و سەربازەکانی کوژران و گیران. ئەمانەللا خان بە زنجیرکراوی ناردی بۆ (دار الخلافە)ی تاران و لە زینداندا مرد.

ئەمانەللا خان، پاش ئەوەی لە کاروباری حکومەتدا جۆریک سەربەخۆیی بە دەستهینا، لە سالی (١٢١٨ک)دا چوار کوری محەمەد رەشید بەگی کوشت کە سەرلەبەری کاروباری ویلایەت بە دەست ئەوانەوە بوو. پاش کوشتنی ئەو چوارە، حکومەتی ئەمانەللا خان بە باشی دامەزراو خەلکی مەملەکەت ترسیکی گەورەیان بەرامبەر ئەمانەللا خان لینیشت. ئەمانەللا خان لە چاوی خەلکیدا بووە خاوەنی زەبروزەنگیکی تەواو و کەس توانای ئەوەی نەما سەرپیچی لە فەرمانی بکات.

ئەمانەللا خان گرنگییەکی زۆری دەدا بە کرینی مولک و کشتوکاڵ و. زۆربەی مولکەکانی کوردستانی خستە ژیر دەستی خۆیەوە. لە هەریەکەیاندا بناغەی بینا، قەلا، مزگەوت، باخ و بیشەی دامەزراندو هەموویانی لە ماوەیەکی کورتدا تەواوکرد. سامان و دەسەلاتی لە سەدان هەزار تیپەریکرد. دوو جاریش بە مەبەستی بالادەستکردنی عەبدولرەحمان پاشا بەسەر مولکی باباندا، رووبەرووی لەشکری عوسمانی بووەوەو شەری لەگەل کردن. لە هەردوو جارەکەدا سەرکەوتوو بوو، و شالاوو پەلاماری ناوچەکانی شارەزوور هەتا بەغدای گرتەوە.

لە سالی (١٢٣٠ک)دا، شاهەنشای قاجار تەنها بۆ ریزلینان لە ئەمانەللا خان، (سەروناز نازخانم)ی لەگەڵ (١٠) هەزار تمەن جەواهیرو کەلوپەل و زیری نەختینەدا بە ئەمانەللا خان بەخشی، کە یەکیک بوو لە کەنیزەکەکانی حەزرەتی پاشا، ئەمانەللا خان ناوی (قبازر خانم– خاتووکەوازیر)ی لیناو چووە ریزی پەردەنشینەکانی حەرەمی ئەوەوە. پاشان لەسەر داوای ئەمانەللا خان، شاهەنشای قاجار تاکە گەوهەری سەلتەنەت، واتە (حوسنی جیهان خانم)ی کچی هیژای خۆی کردە خیزانی خەسرەو خانی کوری ئەمانەللا خان و نازناوی (والیە)ی پیبەخشی. ئینجا ئەمانەللا خان لەگەڵ هەموو زانا، گەورەپیاوان، ئەشرافی کوردستان و کۆمەلیک لە ژنانی ناودارو خاوەن

قورساییدا، چوو بۆ (دار الخلافه)ی تاران. بە پێی ئـیرادەی شـاهانە (واتـە بـە فـەرمانی شا) دەستیکرد بە ئامادەکردنی شاییەکی بێوینــەو جـەژنێکی گـەورە. لـە هەیوانـەکانی میوانخانەو حەوشەکان و بینای شـاهانەدا، کەلوپـەلی سـەیرو سـەمەرەی دامـەزراند، ١٠ ڕۆژو ١٠ شـەو ئاهـەنگی شـــایی و زەمــاوەندی ڕێکخســـت و عـــەوام و خـــەواس، زانـــاو موجتەهیدەکان، بەخشندەو پیاوماقوڵان و شـازادە مەزنـەکان، لـە مەجلیسـی شـایی‌و زەماوەندا ئامادەبوون و پـتر لـە (٢٠٠) هـەزار تمـەن زێـری سـاغی بـۆ مەسـرەفی ئـەم شاییە خەرجکرد. پاشان کە ساتی سەعادەت هاتە پێشەوە، بووکی لەگەڵ خۆیدا بـردو بەرەو کوردستان کەوتەڕێ. محەمەد حەسەن خـان کـە کـوڕە گـەورەی ئەمانـەڵڵا خـان بوو، لەم ئاهەنگ و زەماوەندە نارەحەت بوو و تووشی نائومێدی بوو. چونکە کردارێکی ناشـرینە، فـەزلی کـوڕە بچـووك بدرێـت بەسـەر کـوڕە گـەورەدا. لەبەرئـەوە لـە بـاوکی هەڵگەڕایـەوەو لەگـەڵ کۆمـەڵێك گـەورەپیاواندا، بـەرەو (ذهـاب–زەهـاو) و گـەرمیانی کوردسـتان هـەڵات. خـۆی لەگـەڵ خێڵـە کوردەکـاندا کـە ئـەو کاتـە لـە گـەرمیان بـوون ڕێکخست و سوپایەکی ڕێکوپێکـی سـازکردو دەسـتیکرد بـە پـەلاماردانی سـنوورەکانی کوردستان. ئەمانەڵڵا خان چەندین جار پیاوەکانی خۆی نـاردە لای بـۆ ئـەوەی بکەونـە نێوانیانەوەو دڵنەوایی بکەن، سوودی نەبوو. کە هـەواڵی یـاخیبوونی محەمـەد حەسـەن خـــان گەیشـــتە کاربەدەســـتانی دەوڵـــەت، لـــە لایـــەن (نـــواب عـــەباس مـــیرزای نایبولسەلتەنە)وە، فەرمانێك بە خـەت و ئینشـای (قایمقـام– وەلیعـەهد) سـەبارەت بـە تەمێکردنی حەسەن عەلی خان دەرچوو، کە ئێستا ڕەشنوسی ئـەو فەرمانـە لـە دیوانـی قایمقـامدا چـاپکراوەو هـەڵگیراوە. دەرچوونـی ئـەم فەرمانـەش سـوودی نـەبوو و لای محەمەد حەسەن خان وەکو (اساطیر الاولین) وابـوو. پاشـان لـە لایـەن فەتحعـەلی شـای شاهەنشـای قاجـارەوە، بابـا عـەلیخانی (شاتریاشـی)[٤١] نـێردرا بـۆ ڕاکێشـانەوەو دڵدانەوەی. هاتنی بابە عەلیخانیش سوودی نەبوو. محەمەد حەسەن خان پتر لە جـاران سوور بوو لەسەر جەهل و یاخیبوونی خۆی. ناچار ئەمانەڵڵا خان فەرمانی کۆکردنەوەی

سوپای دا. له ماوەیەکی کەمدا سوپایەکی گەورە لە سنە کۆبۆوە. ئینجا چوو بۆ بەرەنگاری کورەکەی. بابا عەلی خانی شاترباشیشی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ ئەوەی بکەویتە نیوانیانەوەو ریکیان بخاتەوە. لە گوندی (ناراوی) کە یەکیکە لە گوندەکانی (رەوانسەر)ی کوردستان، سوپای باوك و کور بەرامبەر بە یەك ریزیان بەست. چەندین جار بابا عەلی خانی شاترباشی لەگەڵ (مەلا عەباسی شیخولئیسلام)دا، بەرەو سوپای محەمەد حەسەن خان دەرۆن و کەلامی خودا (قورئان) دەکەنە شەفیع، بەڵام سوودی نەبوو. سەرەنجام شەرو کوشتار روویدا. شایانی باسە ئەم نەبەردە یەکیکە لە نەبەردە بەناوبانگەکانی جیهان و شایانی ئەوەیە میژوونووسان لە لاپەرەکانیمیژووی خۆیاندا، بە وردی دریژەی ئەم شەرە، وەك پەندیك بۆ خەلکی بنووسنەوە. چونکە فەرماندەی ئەم دوو سوپا جەنگاوەرە، باوك و کور بوون، جەنگاوەرو پالەوانەکانی هەردوولاش لەگەڵ باوك و کوردا، برا، مام، خاڵ یاخود ئامۆزا بوون، لەناو ئەم دوو دەستە سەربازەدا بیگانەی تیدا نەبوو. پیاوی عاقڵ و هوشیار دەزانیت نەبەردی ئاوا چەند بە گران دەبریتەوەو، شەری باوك لەگەڵ کور و برا لەگەڵ برا لە پیناوی ناو و ناوبانگدا، توانایەکی چەند گەورەی دەوێ.

بەهەرحاڵ، سوارەی هەردوولا کەوتنە هیرش و پەلامار، تیر لە کەوانەکانەوە بەرەو ئاسمان فرین و رم کەوتە پیکان، دلیرانی هەردوولا کوشتاریان کردو مەردانی هەردوو بەرە، شیریان هەلکیشا. بە یەکجار پەلاماری یەکیان داو وەکو تان و پۆ تیکەڵاوی یەکتر بوون. شمشیر وەشنیراو خەنجەر گیانی کیشا. محەمەد حەسەن خانی والیزادە، وەکو شیری نەرو بەوری زامدار بە هەموو لایەکدا هەلدەسووراو لاشەی کوژراوی هەلدەچنی.

| | |
|---|---|
| **در ان معرکه أن یل ارجمند** | **بەشمشیر و خنجرو گرزو کمند** |
| **دریدو بریدو شکست و ببست** | **یلان را سرو سینەو پاو دست**(٤٢) |

مـیرزا عەبدولکـەریمی (موعتەمـەد) و مـیرزا فـەرەحوللای وەزیـر، کـە هــەردووکیان ئـامۆزای ئەمانـەللا خـان بـوون و لــەناو سـوپاکەیدا بـوون، لــەو مەیدانــەدا مەردانــە شەریانکرد. کۆمەلیك لـە سـەربازەکانی والـیزادە پـەلاماریاندان و چواردەوریـان گرتـن. محەمەد بەگی حاجی حسین بەگی سەقزی، گـەردنی مـیرزا عەبدولکـەریمی بـە شمشـیر زامدار کردو لە راستیدا گیـان لـە جەسـتەی دەرچـوو. خزمـەکانی لـە مـەیدان هینایانـە دەرێو لە کەناریکدا کەوتنە تیمـارکردنی. کۆمـەلیك لـە خزمـەکانی مـیرزا فـەرەحوللای وەزیر، بۆ رزگارکردنی (واتە بـۆ رزگـارکردنی وەزیـر) بـەرەو مـەیدانی نەبـەرد شـالاویان برد. میرزا لوتفوللا کە یەکیك بوو لە ئامۆزاکانی مـیرزا فـەرەحوللاو پیـاویکی بیئـەندازە ئـازا بـوو نیشـانی لـە والـیزادە گرتـەوە، بـە گوللەیـەك خسـتیو بـەدیل گرتـــی. مــیرزا سادقخانی باوکی شەرەفولمولك، کە ئەویش کوری ئەمانەللا خان بـوو و بیئـەندازە ئـازا بوو، لەم هەرایەدا بە خەستی بریندار بوو.

بەهـەرحالْ، کـە سـەربازەکانی والـیزادە، فەرماندەکـەیخۆیان بـە زامـداریو دیلـــی بینـی، کەوتنـە شـکان و هـەلاتن و، کۆمـەلیکیان بـە دیـل گــیران، هەندیکیشــیان بــە سەلامەتی دەرچوون. ئەوانەی بە دیل گیران لە (١٠٠) کەس پـتر بـوون. ئەمانـەللا خـان هـەموویانی کوشـت. بـە جۆریـك کـە کـوری دەدایـە دەســت بـاوك و حوکمــی دەکــرد بیانکوژن. بە هەمان شیوە برای دەدا بە برا بۆ ئەوەی بیکوژیت. لـە مـەیدانی نەبـەردا (٤٤٠) کەس لە میرو گەورەپیاوانی کوردستان کوژران، ئینجـا هـەردوو والـیزادە گەنجـە زامدارەکەیان خستە سەر نەقالەو بەرەو سنە کەوتنەرێ.

پاش مانگیك محەمەد حەسەن خان دنیای فانیی بەجیهیشت و محەمەد سادق خـان بە ســەلامەتی ژیـا. پـاش ئـەم رووداوانـە، ئەمانـەللا خـان لـە داخـی کـورە گەنجەکـەی ماوەیەك عەقلی تیکچوو، تا لە سـالی (١٢٤٠ك)دا، دنیـای پـر شـەرو شـۆری جیهیشـت، ماوەی حوکمکردنی ٢٧ سالی تەواو بوو. پاش مردنی، خەسرەو خانی کـوری کـە زاوای شاهەنشای ئیران بوو، لە جیی باوکی بووە والی ویلایەت و میری مەملەکەت.

## باسی حوکمرانی خەسرەو خانی کوری ئەمانەللاّ خان کە بە (ناکام) بەناوبانگە

ئەم خەسرەو خانە خۆش گوفتارو خۆش روو بوو. شیعری جوانی دەگـوت و خـەتی (نەستەعلیق)[٤٣]ی بە جوانی دەنووسـی. سـامان و توانـای خەسـرەو خـان لـە جیـهاندا ناوبانگی دەرکـرد. پیشـی سـەخییەکانی جیـهانی دایەوەوحاتـەمی تـەی شـاردەوە، لـە سالی (١٢٤٠ك)دا، ئـاگری قـاتوقریو گرانـی کوردسـتانی گرتـەوەو بلیسـەی بـەلاّ تـاوی سەند. نرخی نان گەیشتە نرخـی گیـان و، گـەلیك کەسـی نـەفس بـەرز، لـە ژن و پیـاو، تووشی ئەم بەلایە بوون و دنیـای فانییـان بەجیهیشـت. خەسـرەو خـانی والی، نزیکـەی (٥٠) هـەزار تـەغار گـەنم و دانەویلـەی تـری لـە عـەمارەکانی خۆیدا هــەلگرتبوو، هــەر هـەمووی بەسـەر دانیشـتواندا دابەشـکرد بـەبێ جیـاوازی. سـەنەدی لـە هەریەکەشـیان وەرگـرت، کـە پـاش تـەواوبوونی قاتوقریەکـە، پارەکـەی تەسـلیم بکـەن. ئـەم لوتـف و بەزەییەی والی خەلکی ویلایـەتی لـە برسـیتی رزگـار کـرد. کـاتیك کـە خـەلکی ویلایـەت ئاسوودە بوون و قاتوقری تــەواو بـوو، مـیرزا فـەرەحوللاّی وەزیـر ئـەو سـەنەدانەی کـە خـەلکی کوردسـتان لـە بەرامبـەر نرخـی گـەنم و دانەویلـەدا دابوویـان، بردنــی بــۆ لای خەسرەو خانی والی بۆ ئەوەی فەرمانی وەرگرتنــەوەیان بـدات. خەسـرەو خـانی والی لـە بەخشندەیی و دەست و دلفراوانی خۆیەوە، سەنەدەکانی ئەهلی ویلایەتی (کە بایی پــتر لە سەدو پەنجا هەزار تمەن دەبوون) فریدایە نیو ئاگرەوەو سوتاندنی. بەم بەخشینەش بیئـەندازە خـەلکی دلشـادو شـادمان کـرد. لـە راستیشـدا چاکـەو بەخشـینیکی ئـاوا لـە سولتانە مەزنەکانیش نەبیستراوەو نەبینراوە.

لە سالی (١٢٤٦ك)دا شا مـوراد بـەگی کـورد کـە بـە مـیری رەوانـدز بەناوبانگـە، لـە ناوچەی رەواندزو کۆیەو حەریردا هــیزی پـەیداکردو کەوتـە ئاشـوب و ئاژاوەنانـەوە. لـە ناکـاو پــەلاماری (ســەر..)[٤٤] و (ســاوجەبلاّغی موکــری) و (سەردەشــت)ی داو ئــەو

ناوچانەی گرت. کاتێك کە ئەم هەواڵە گەیشتە سولتان فەتحعەلی شای شاهەنشای قاجار، فەرمانێك بۆ خەسرەو خان دەرچوو سەبارەت بە لەناوبردنی. خەسرەو خانی والی بێ درەنگ بە سوپایەکی گەورەوە چوو بۆ بەرەنگاربوونەوەو شەرکردنی. لە ماوەیەکی کورتدا لەشکری میری رەواندزی شکاندو تا (خوی)[٤٥] و حەریر دوایکەوت. بری (٣٠) هەزار تمەن زیری نەقدیشی لە میری رەواندز سەند، وەکو سزایەك بۆ ئەو زیانانەی دابووی. پاشان ئەمانی دایە، گەرایەوە بۆ ویلایەتەکەی خۆیو بەر لوتفی شاهانە کەوت.

لە ساڵی (١٢٤٧)دا، مەحمود پاشای بابان لە دەست سلیمان پاشای برای رایکردو پەنای هێنایە بەر دەوڵەتی ئێران. بە فەرمانی پاشای ئێران، خەسرەو خانی والی سوپایەکی ئامادەکردو لە ناوچەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا کەوتە هێرش و پەلامار. دووبارە مەحمود پاشای لە سلیمانی دانایەوە. سلیمان پاشا رایکرد بۆ (دار السلام)ی بەغداو والی بەوپەری هێزو دەسەڵاتەوە گەرایەوە بۆ کوردستان.

لە ساڵی (١٢٥٠ك)دا، نەخۆشی تاعون لە شاری سنە بڵاوبۆوە. خەڵکی کوردستان لە ترساندا پەرش و بڵاو بوونەوە، والی لە دووری (١٠٠٠) پێ لە شاری سنەوە، خێوەتو چادری خۆی دامەزراندو چووە ئەوێ. لە (رەبیعولئەوەل)ی هەمان ساڵدا، پاش حەوت رۆژ نەخۆشی، جوانەمەرگ بوو. ئەم والییە ٢٩ ساڵ ژیا. ماوەی حکومەتی خەسرەو خان ١٠ ساڵی تەواوبوو. لە کچی پاشای ئێران سێ کورو سێ کچی بوو، باسی هەریەکەیان لە شوێنی خۆیدا دەنووسرێت.

پاش مردنی خەسرەوخانی والی، (رەزا قولیخان)ی کورە گەورەی کەلە حوسنی جیهان خانمی ناسراو بە (والیە)ی کچی فەتحعەلی شای قاجار بووبوو، چووە سەر کورسیی سەرۆکایەتی. ئەوکاتە رەزاقولیخان تەمەنی ١٠ ساڵان بوو.

## باسی حکومەت و رۆژگاری ژیانی رەزاقولیخانی والی

## کوڕی خەسرەو خانی بەناوبانگ بە ناکام

والیەی دایکی ڕەزا قولیخان، هەموو ئەرکەکانی مولکـی گرتـە ئەسـتۆی خـۆی. لـەم ساڵەدا (ئەردەشیر میرزای ڕوکنولدەولە) کە حاکمی گەڕوس بوو، هـەولی دا کوردسـتان بگریت و بە سوپایەکی گـەورەوە هـات بـۆ جـەنگ، بـەڵام بـە نەنگـەوە گەڕایـەوە. لـەم نەبەردەدا والیە خۆی بە سەرپۆش و سەروبەستەوە بوو بە سەرداری لەشکر.

لە ساڵی (١٢٥١ك)دا، کاتێك کە سەلتەنەتی ئێران کەوتە دەست سولتانی سـەڵاتین، سولتان محەمەد شای قازیی ناودار، شازادە حوسنی جیهان خانمی والیە، (توباخـانم)ی خوشـکی ئـەو پاشـا پایەبـەرزەی کـردە دەسـگیرانی ڕەزا قولیخـانی والی. لـە سـاڵی (١٢٥٢ك)دا، لەگەڵ کۆمەڵێك لە ئەشراف و گەورەپیاوانی کوردستاندا چـوون بـۆ تـاران. بە ڕێورەسمێك کە شایانی پاشایان بوو، بووکیان هێنا بۆ کوردستان.

ماوەی پێنج شەش ساڵ ڕەزا قولیخان بە پێی ڕێنماییو بەرنامەی دایکی حکومڕانی کرد. لە سەرەتای ساڵی (١٢٥٧ك)دا،مەحمود پاشای بابان لەگەڵ ١٠٠٠ کەس لە گـەورە پیـاوانی مولکـی بابـاندا، پـەنایان هێنایـە بـەر کوردسـتان و ڕەزا قولیخـان. لـە لایـەن والیشەوە، ئەرکی میوانداریو خانەخوێیی تا دوائەندازە بە جێگەیەنرا. پاش دوو مـانگ ڕەزا قولیخانی والی، مەحمود پاشاو پیاوماقوڵ و گـەورە پیـاوانی بابـانی لەگـەڵ خۆیـدا برد بۆ تاران. والی و مـەحمود پاشـاو یاوەرەکانیـان بـەر لوتـف و مەرحەمـەتی شـاهانە کەوتن و ڕوخسەتیان درا بگەڕێنەوە بۆ کوردستان. فـەرمانی شـاهانە دەرچـوو کـە والی مەحمود پاشا بەرێتەوە بۆ مولکی بابان و دەسەڵاتی بداتـەوە دەسـت. والی دەسـتیکرد بە ئامادەکردنی پێویستیەکانی ئەم کارە، لەشکرێکی ئامـادەکردو بـەرەو مولکـی بابـان کەوتەڕێ. لەم کاتەدا، ژێربەژێر ناکۆکی کەوتبووە نێوان والی و کۆمـەڵێك لـە وەزیـران و خەڵکی کوردستانەوە. ئەم کۆمەڵە کە سـەرۆکەکەیان مـیرزا هیدایـەتوڵڵای وەزیـر بـوو، کەوتنە تێکدان و شکست پێهێنانی کارەکەی والی. هەر کە گەیشتنە کەناری دەریاچـەی مەریوان، میرزا هیدایەتوڵڵا کە بە تەواوی لە والی هەراسان بووبوو و دەیویست شکسـتی

پیبینێ، هەموو عەشیرەتە نـاودارو دلاوەرەکـانی کوردسـتانی لەگـەڵ مـەحمود پاشـادا نـارد بـۆ سـلیمانی بـۆ ئـەوەی دەسـەلات بدەنـەوە دەسـتی. لەژێریشـەوە بـە عـەبدوللا پاشای راگەیاند کە من دلاوەرە ناودارەکانم لە لەشکری والیدا نەهیشتووە، ئیستا کـاتی ئەوەیە بە پەلە پەلاماری بدەی. عەبدوللا پاشا بە فەوجیك سـەربازو دوو هـەزار سـوارو چـوار تۆپـەوە، بـەرەو دەریاچـەی مـەریوان و لەشـکری والی کەوتـەرێ. لـە سـەعاتی دووەمـی رۆژی چـوار شـەممە ١٤ی رەبیعولئـەوەلی ١٢٥٧دا، گەیشـتە نیـو فرسـەخیی سوپای والی. میرزا هیدایەتوللا کۆمەلیك لە خزم و پیاوەکانی خۆی دەکاتـە پیشـقەراوڵ و پیشەنگی سـوپا، لەژێریشـەوە رایاندەسـپیرێ هەرکـە بوقـی سـوپای عـەبدوللا پاشـا دەنگی لیوەهـات، هـەلبین و بـەرەو سـوپاکەی خۆیـان بگەرینـەوە. بـە ریکـەوت مـیرزا فەزلوللاو محەمەد رەزا بەگی رەشتی و شیخ عەلی بەگ و میرزا ئەبولفەتح ناویك کـە لـە عەشیرەتەکانی تری کوردستان بوون، بە بێ ئیجازەی وەزیر لەگەڵ پیشقەراولاندا چون بۆ قەراولی، لەولاوە (پیشقەراولانی)(٤٦) عەبدوللا پاشا بە هـەزار تـرس و دلـەراوکێ، تـا نزیکـەی نیـوەرۆی هـەمان رۆژ، تووشـی پیشـقەراولەکانی والی دەبـن و بوقـی شـەر لیدەدەن. ئەو قەراولانەی کە خزمـی مـیرزای وەزیـر بـوون، بـی درەنـگ رایـانکرد، ئـەو ژمارە کەمەی کە لە سـەرەوە ناومـان بـردن، هـەلاتنیان بـۆ خۆیـان بـە جـوان نـەزانیو دەستیانکرد بە شەر، بەلکو لە لایەن والییەوە یارمەتییان پیبگات. کاتیك والی بـە مـەی زانـی، بۆیدەرکـەوت ریوشـوینی وەزیـرە فیلبازەکـەی، خـۆیو سوپاکەیشـی تووشـی دۆخیکی خراپ کردووە. عەبدولحەمید سولتانی بانەیی لەگەڵ هەزار تفەنگچی بانـەیی و سەقزیدا نارد بـە هانـای قەراولەکانییـەوە. خۆیشـی لەگـەڵ ئـەو ژمـارە کەمـەدا کـە لـە سوپاکەیدا مابوونەوە، سواربوو و بەرەو مەیدانی شەر کشا.

میرزا هیدایـەتوللای وەزیـر لـە لایەکـەوە بـە عەبدولحـەمید سـولتان دەلیـت چوونـە مەیدان و مردن لەگەڵ والیدا شیتیو نەزانییە، برۆ بەلام خۆت لە گیرەو کیشە بـەدوور بگرە، لە لایەکی تـرەوە هـەمان مـیرزای وەزیـر بـە جـەختکردن و پیداگرتـن والی ناچـار

دەکـات هــەلبیت. بەهــەرحاڵ، هــەر هــەموو پیشــقەراولەکان لــە شــەردا کـــوژران. عەبدولحەمید سولتانیش بە پیی رینماییەکانی وەزیـر، خـۆی (لـە شـەر) بـەدوور گـرت، بابانیەکان بەرەو سوپای والی هیرشیان هینا، لەم هـیرش و پەلامارەشـدا کۆمـەلیکیان لەگەڵ خۆیان راکیشا، پاشان سوپاکەیان تاڵانکردو گەرانەوە(٤٧).

کاتیك کە رەزا قولیخـانی والی هاتـەوە ناوشـار، مـیرزا عەبدولحـەمید نـاویکی نـاردە تاران کەلە نەجیبزادەکانی ویلایەت بوو، بۆ ئەوەی چاریکی مەسەلەکە بکات و لە لایەن دەسـەڵاتدارانی دەلەتـەوە، یارمەتییـەکی پیبگـات. پـاش ئـەوەی مـیرزا عەبدولحـــەمید گەیشتە دەرباری شاهانە، سزادراو کوژرا، لە ناوەندی خەلافەتــەوە حوکمیـك سـەبارەت بە بانگکردنی والی و ئەهالی دەرچوو. پاش ئەوەی والی گەیشت، لەسەر کار لابـرا، مـیرزا هیدایەتوڵلا کرایە خاوەن بریاری کوردستان و بەرپرســی کۆکردنـەوەی بـاجی دیـوان و، بەرەو کوردستان رەوانە کرا.

میرزا هیدایەتوڵلا کە گەیشتە کوردستان، (عەباس قولیخان)ی مامی رەزا قولیخـانی والیی کردە جیگری حکومەت (نایب الحکومـە) و بریارەکـانی ویلایـەتی بـە مۆریـك مـۆر دەکرد کە ناوی ئەو والییەی لەسەر هەلکـەنرابوو. پـاش سـێ مـانگ عـەباس قولیخـانی لابردو محەمەد سادق خانی بـرا گـەورەی عـەباس قولیخـانی کـردە جیگـری حکومـەت. هەژدە مانگ بەم شیوەیە کاروباری کوردستانی بەریوە برد.

لە سـالی ١٢٦٠دا دووبـارە حکومـەتی کوردسـتان بـە رەزا قولیخـانی والی بەخشـرا. رەزا قولیخان ئەمانەڵلا بەگی وەکیل و کۆمەلیکی تر لە پیاوانی کوردستانی لەگەڵ توبا خانمی خیزانیدا کە خوشکی شــەهریاری قاجـار (محەمـەد شـای غـازی) بـوو، رەوانـەی کوردسـتان کـردو خۆیشـی پـاش چـوار مـانگ لــە تارانــەوە هـات بــۆ کوردســتان. کاربەدەستانی دەولەت (ئیسفەند ئاباد)یان لە حکومەتی کوردستان جیاکردەوەو دایـان بە ئەمانەڵلا خانی برا بچوکی رەزا قولیخانی والی، بۆ ئەوەی خـۆیو مـیرزا هیدایـەتوڵلاو کوردستانیەکانی تری سەر بەو لەوێ نیشتەجێ بن. قەنبەر عەلیخانی (سـەعدولدەولەی

مافی)یش رادەسپێرن کە ئەرکی کۆچپێکردنیکەس و کارو پیاوەکانی ئەمانــەللاّ خـان و میرزا هیدایەتوللاّ لە سنەوە بۆ ئیسفەند ئاباد بگریتە ئەستۆ.

بەهەرحاڵ، رەزا قولیخان دوو سالی تەواو بەوپەری دەسەلاّتەوە حوکمرانی دەکات. پاش دوو ساڵ، لەسەر کار لادەبرێو ئەمانەللاّ خانی برا بچوکی و رەزا قولیخـان کـە بـە (غولامشاخان) بەناوبانگە، لـە جیگـەی دادەنریت، ئـەم ئەمانـەللاّ خانـە پـاش ئـەوەی گەیشـتە کوردسـتان، لەگـەڵ فەرمانبـەرو پیاوەکــانی رەزا قولیخــاندا زۆر بــە تونــدی رەفتاری کرد. ئەمانەللاّ خانی وەکیل و دەمراستی[٤٨] رەزا قولیخانی کوشت. ئەوانی تر بـەرەو سـلیمانی کۆچیـانکرد. لـە لایـەن دەولەتـەوە، مـیرزا رەحیمخــانی پیشــخزمەت (خزمەتکار) راسپیردرا کە توبا خانم لە سنەوە بـەرەو ئیسـفەندئاباد بگویزیتـەوە. توبـا خانم نوسراویك بۆ حاجی مـیرزا ئاغاسـی سـەدری ئـەعزەم دەنووسـێو دەلـێ: تـۆ ئـەو کەسە نەبووی کە چەندینجار دەتفەرموو دلسـۆزیو راسـتگۆییم لـە ئاسـتی مندالـەکانی (نایبولسـەلتەنە)دا بیئەندازەیـە؟ چـۆن بـوو لـەو پلـە بـەرزەوە کەوتنـە خـواریو بـەم شیوەیە لە بەرچاوت کەوتن؟

**دوران بقا چو باد صحرا بگزشت        نیکیو بدیو زشت و زیبا بگزشت[٤٩]**

کە ئـەم نامەیـە دەگاتـە حـاجی مـیرزا ئاغاسـی، لـە کردەی پەشـیمان دەبیتـەوەو وەلاّمدەداتەوە: ئەوەی فەرمووتانە خودی راستییەو هیچ نیە جگە لە راستی. ئەگەر بـە پیـی (الانسـان محـل النسـیان) کەموکورییــەك لــە خزمــەتگوزاریدا لــەم بــەندە بــێ ناوونیشانەوە روویدابێ، دەبێ بە گەورەیی خۆتان بیبەخشن. باشتر وایـە بـەندەیش لـە بەرامبەر کەموکوری خۆیدا، داوای بەخشین لە دەرباری یەزدان بکات. ئینشاللاّ تەنگانـە بەسەر دەچێو ئەوەی چووە حەقی دەکریتەوە. بە نهینیش عەرزی دەکا: ژەمیك تلیاك مەیل بفەرموون و لە ژیر سیبەری داربیدا دانیشن. هیوادارم بــەم زووانـە رەزا قولیخـانی والی بە خزمەت بگات.

زۆری نەبرد حاجی میرزا ئاغاسی سەدری ئەعزەم پەیمانەکەی خۆی بــە جیگــەیاندو ڕەزا قولیخـانی نـارد بـۆ حکومـەتی کوردسـتان. حکومـەتی ئەمانــەڵلا خـــان و لەســـەر کارلابرانی ڕەزا قولیخان پینج مانگ دریژەی کیشا.

کە ڕەزا قولیخان بۆ جاری سییەم حکومەتی کوردستانی وەرگرت و هـات بـۆ سـنە، سەرەتا ئەو کەسانەی گرت کە دەستیان لە کوشتنی ئەمانــەڵلا بـەگی وەکیلـدا هـەبوو. لەوانە جەعفەر قولیخانی بەنی ئەردەلان، مـیرزا ئیسـماعیلی داروغـە، مـیرزا ئیـبراهیمی مونشی[٥٠] و (ئەلقاس —القاص) ناویك کە فەراش بوو. هەریەکـەیانی بـە جۆریـك بەسـزا گەیاند. دوو سالی تەواو بەوپەری دەسـەڵاتەوە حوکمرانـی کـردو مەملەکـەتی ریکوپیـك کرد. پاش دوو سـاڵ، نـەیارەکانی ڕەزا قولیخـان لـە دەربـاری پاشـادا تاوانباریـان کـرد بەوەی لەگەڵ بەهمەن میرزای برای شاهەنشای غـازیدا کـە لـەو کاتـەدا لـە ئازەربایجـان فـەرمانرەوا بـوو، دۆسـتایەتی هەیـەو لەگـەلیدا یـەکی گرتـووە، لـە لایـەن دەولەتـــەوە، خەسرەو خـــانی خواجـە کـە یـەکیك بـوو لـە والیزادەکـانی گورجسـتان و لـەم دەولەتـە سـەرمەدیەدا پلـەو پایەیـەکی هـەبوو، لەگـەڵ سـوارەی (زیـن العـــابدین)ی شاهســـون و سلیمانخانی ئەفشارو خەلکانی تردا، ڕاسپیردرا کـە بەهمـەن مـیرزاو ڕەزا قولیخـانی والی بگریت. هەر کە خەسرەوخان لە ریگەی (ئەشتەهارد)ەوە کەوتەرێ، بەهمـەن مـیرزا لـە مەسـەلەکە تیگەیشـت و زۆر بـە پەلـە خـۆی گـەیاندە دەربـــاری شـــەهریاری عەجـــەم. خەسرەو خان وازی لە چوونە ئازەربایجان هینا، هاتــە سـەر سـنووری کوردسـتان و بـە ڕەزا قولیخانی راگەیاند کە لەم ناوچانەدا ئەرکیکم پیسپیردراوەو پیویستە ئیوە ببینــم. ڕەزا قولیخان لەبەرئەوەی هیچی لە خۆیدا شك نەدەبرد، بێ دوودلی ڕوویکـردە سـوپای خەسرەو خان. کاتیك والی چووە مالی خەســرەو خـان، خەسـرەو خـان نـانی نیـوەرۆی دەخوارد، پاش موجامەلەی ڕەسمی، هەردووکیان دەستیانکرد بـە نـانخواردن. والی بـی ئاگا بوو لــەوەی ئـەم کاسـەیە سـەرەنجام کوشـندە دەبـێ. هیشـتا میـوان دەسـتی لـە خـواردن هەلنـەگرتبوو، بـە ئامـاژەی خەســرەو خـــان کۆمـــەلیك خۆیـــان کوتایـــە نـــاو

خیوەتەکەوەو پەلاماری والییان دا. خزمەتکارو یاوەرانی والییان روتـو قـووت کـردەوە. خەسرەو خان، والیی بە زنجیرکراوی نارده تاران و خۆی چوو بۆ سنه. لـەوێ خـۆی بـە کاروباری حکومەتەوە خەریککرد. لەولاوە رەزا قولیخانیان برده تـاران و لـە تۆپخانـەی دەولەتدا بەندیان کرد.

## باسی حکومەت و رۆژگاری حکومرانی خەسرەو خانی گورجیی لە کوردستاندا

کـاتیك کـە خـەلکی کوردسـتان بـەم مەسـەلەیەیان زانـی، کۆمـەلیك لـە عەشـیرەتە ناودارەکـانی کوردسـتانیان نـارد بـۆ تـاران و لـە مزگـەوتی (شـا)دا جیگـیر بـوون (مانیانگرت). کاتیك کە حاجی میرزا ئاغاسی یاخیبوونی خەلکی کوردسـتانی بینـی، لـە کارەکەی خۆی پەشیمان بۆوە، بەلام ناچار بۆ ئەوەی کاروبارەکانی خەسرەو بە باشـی بەریوە بچیو حکومەتەکەی پتـەوبیت، چـوار تـۆپ و یـەك فـەوج سـەربازی (عـەلیخانی قەرەگوزلو)ی نارد بۆ کوردستان. لە تاران چەندین جار عەزیتی کوردستانییەکانیان دا، بەلکو دەست لـە خزمـەتی رەزا قولیخـان هـەلگرن و بگەرینـەوە بـۆ کوردسـتان، بـەلام سوودی نەبوو. بە جۆریك کە لە حوزوری شـەهریاری عەجـەمدا پینـج هـەزار داریـان لـە عەلی محەمەد بەگی وەکیل دا کە سەرۆکیان بـوو، دیسـان رازی نـەبوون بگەرینـەوە بـۆ کوردستان و زیاتر پییان داگرت. تا لە مانگی (شـەوال)ی ١٢٦٤دا، شـەهریاری عەجـەم ئەم جیهانەی بەجیهیشت و چووە شوینی حـەقی خـۆی. لـەم کاتـەدا رەزا قولیخـان لـە گونـدی (تـەجریش) بـەندبوو کـە تۆپخانـەی دەولـەتیی لییـە. کوردسـتانییەکان کـە لـە قسەی حاجی میرزا ئاغاسی و کردەوەی خەسـرەو خـانی خواجـە بـە تـەواوی پەسـت و بیزار بووبوون، بیئاگاداری و رەزامەندی رەزا قولیخان پەلاماری گوندی تەجریشـیان دا، ناچاریـانکرد لـە تۆپخانـە بیتـە دەرێو لەگـەڵ فـــەوجی گەروسـدا بـــەرەو کوردســـتان بوونەوە. کە هەوالی هاتنی رەزا قولیخان گەیشتە خەسرەو خان، بیجگە لە هەلاتن هیچ

چاریکی تری نەدی، لەگەڵ فەوجیك سەربازو دوو تۆپدا لە ریگەی گەروسەوە رایکرد بـۆ زەنجـان. لـەملاوە، رەزا قولیخـانی والی هاتـە نـاو شـاری سـنەوەو خـەڵاتیکی شـایان و فراوانی سەرکردەکانی فەوجی گەروسی کرد کە لەگەلیدا هـاتبوون. خـەلکی مەملەکـەت بە دیداری شادبوون.

## باسی حکومەتی چوارەمی رەزا قولیخانی والی کوری خەسرەو خانی بەناوبانگ بە ناکام

والیو ئەهالی پیویستییەکانی خزمـەتی دەولـەتیان ئامـادەکردو کەوتنـە ریکخسـتنی سنوورو ئاسودەکردنی رەعیـەت. کـە شاهەنشـای خـاوەن شـکۆ (ناسـرەدین شـا)[٥١]ی بەختیار بوو خاوەنی تـاج و تـەخت و، کـەژاوەی ئـەو شـەهریارە لـە تـەوریزەوە بـەرەو تـاران کەوتــەرێ، ئەمانــەللا خــانی بــرا بچوکــی رەزا قولیخــانی والی کـــە نازنـــاوی (غولامشـاخان) بـوو، بـۆ پیشـوازی لـە کـەژاوەی رازاوەی سـولتانی، تـــا (ســولتانییە) بــەرەوپیری چــوو. رۆیشــتنی ئەمانــەللاخان لــە لایــەن کاربەدەســتانی دەولەتــەوە ستایشکرا. لە لایەن رەزا قولیخانی والییەوە، محەمەد عـەلیخانی سـەقزیو مـیرزا ئـەللا قولی داروغە، بەدەست و دیاری فراوانـەوە چوونـە لای سـوپای کـەیوان پیـو. ئەمانـەللا خان لە دیوانخانەی مـیرزا تـەقیخانی ئـەمیر کـەبیر[٥٢] دابـەزی و بـووە هاوسـیی. پـاش شەش مانگ حکومەتی کوردستانی پیبەخشراو رەزا قولیخان لابرا. ئەمە دوا حکومـەتی رەزا قولیخانی والی بوو، جاریکیتر حکومەتی نەکەوتەوە دەست و لە تاران مایەوە. لـە سەفەری (گورگان)دا، بـووە یـاوەرو یـاریدەدەرو جیگـری محەمـەد خـانی سوپاسـالاری ئەعزەم. رەزا قولیخان پیاویکی ئازا، رەشیدو بە جەرگ بوو. دەسـتو بـازوی بیئـەندازە بــەهیز بــوو. ئــەوەندە لــە خــەمی کۆکردنــەوەی زیــرو زەردا نــەبوو. هەرچیـــەکی دەستدەکەوت، دەیبەخشی بـە خزمـەتکارو پیاوەکـانی خـۆی. لـە توباخـانی خوشـکی شاهەنشای پیشـوو، سـێ کـوری هەیـە کـە هەرسـیکیان بـە پـاکیو، چـاکی سروشـت و

باشیی نیەت ناسراون. یەکیکیان خەسرەو خانە کە نازناوی (والی)یە. ئەویتریان محەمەد عەلیخانە کە نازناوی (زەفەروالملك)ەو چەندین سالە فەوجی کوردستان و سێ ناوچەی گەورەی کوردستان بەریوە دەبات. سیهەمیان ئەبولحەسەنخانی (فەخرولمولك)ە کە خزمەتکاری تایبەتی شاهەنشای قەدرزانەو یەکیکە لە مەحرەم و نزیکەکانی. ئینشاللا حالەتی هەریەکەیان لە شوینی خۆیدا باسدەکەین.

## باسی حکومەت و رۆژگاری ژیانی ئەمانەللاخانی دووەم کە بە غولامشاخانی والی بەناوبانگە

بەهەرحاڵ، ئەمانەللا خانی ناسراو بە غولامشاخانی والی، رۆژی دوو شەممەی (١٤ی جەمادی دووەمی ١٢٦٥) هاتە ناوشاری سنەوە. لەگەڵ خەلکدا بە بەزەیی‌و میهرەبانی رەفتاریکرد. میرزا ئەللا قولیخانی کردە (پیشکار) و محەمەد عەلیخانی سەقزی کردە جیگری ویلایەت (نایب الایالە). پاش سێ مانگ ئاهەنگیکی زەماوەندی بۆ خۆی سازکرد. ئافتاب سولتان خانمی کچی حسین قولیخانی مامی خۆی هینا. ئەم خاتو ئافتاب سولتانە لە پاکی‌و جوانی‌و ژیریدا، ویردی سەرزمانی خەلك بوو.

بەهەرحاڵ، لەم سالەدا بە فەرمانی میرزا تەقیخانی ئەمیر کەبیر، غولامشاخانی والی یەك فەوج سەربازی لە گوندو ناحیەکانی کوردستان گرت، کە بریتی بوو لە هەزار کەس. بە پیی یاسای دانراوی دەولەت، سەرهەنگ و یاوەرو سەروان(٥٣) و دەرەجەدارەکانی تری بۆ فەوجەکە دانا. بۆ نموونە خان ئەحمەد خانی برا بچووکی خۆی کردە سەرهەنگی فەوجەکە. لە مانگی رەجەبی (١٢٦٧ك)دا، کاتیك کە شەهریاری ئیران بەرەو ئەسفەهان سەفەری کرد، میرزا تەقیخانی ئەمیر کەبیر، والی و کۆمەلیك لە دانیشتوانی کوردستانی لەگەڵ ئەم فەوجە نوییەدا بانگکرد. والی زۆر بە پەلە فەوجەکەی بە پیی پیویست ئامادە کردو روویکردە ئەسفەهان. لە (چیمەنی عەلیئاباد) گەیشتە کەژاوەی شەهریاری ئیران. فەوج و سوارەی کوردستان ستایش و

پەسەندکرانو غولامشاخانی والی بەوپەری شانازییەوە گەرایەوە بۆ ویلایەت. لەم سەفەرەدا غولامشاخانی والی ژێربەژێر لەگەڵ میرزا ئاغاخانی سەدری ئەعزەمدا (ئەوکاتە ئیعتیمادودەولە بوو) ڕیکەوت. بە هۆی ئەمەشەوە، کاتێك کەمیرزا ئاغاخان بوو بە سەدری ئەعزەم، هەولی دەدا والی بەهێز بکاو لە حکومەتی کوردستاندا سەربەخۆییەکی تەواوی دایە.

لە کۆتاییەکانی سالی (١٢٦٨ك)دا، حەسەن سولتانی هەورامی ئالآی یاخیبوونی هەلکردو تایەفەی بیبەخت و ملهوری هەورامی یاخیبوون. والی بە ئیجازەی دەولەت، لەشکریکی بۆ تەمیکردنیان ڕیکخست. بە فەوجیك سەربازو چوار تۆپ و دوو هەزار تفەنگچی چریکەوە[٥٤] بەرەو هەورامانی تەخت هیرشی برد. نەجەفعەلیخانی کوری خوالیخۆشبوو حەسەنخانی ئامۆزای خۆیو ئەبولقاسم بەگی یاوەرو کۆمەلیك تفەنگچی چریکی لەگەڵ سوارەی عەشایەری کوردستان و پینج دەستە سەربازدا، لە ڕیگەی جوانرۆو پاوەوە نارد بۆگرتنی هەورامانی لهۆن و بەرەنگاربوونەوەی محەمەد سەعید سولتان. لەلای هەورامانی تەختەوە، والی، خان ئەحمەد خانی سەرهەنگی برای کردە پیشرەوی سوپاو لە ڕیگەی (دەربەندی دزلی)یەوە فەرمانی هیرشیدا. حەسەن سولتان کۆمەلیکی لە دەربەندی دزلیدا دامەزراندو لەگەڵ سوپای والیدا کەوتنە شەرو بەرەنگاری یەك بوونەوە، پاش دوو سەعات ململانێ هەورامییەکان هەلآتن و سەنگەرەکانیان گیرا. دوابەدوای ئەمە، والی لەگەڵ بەشەکەی تری لەشکرەکەیدا چوونە ناوچەکە. خان ئەحمەد خانی سەرهەنگ نەحەوایەوەو، بی دواکەوتن لەویوە بەرەو (هۆشی بەدرانی) کەوتەرێ، کە ماڵ و مەلبەندی حەسەن سولتان و تایەفەی یاخیبووی هەورامی بوو. کاتیك کە خان ئەحمەد خان لە دەربەند تیپەریو هەورامییەکان بە گەیشتنی سوپاکەیان زانی، دلیرانە گوریاندایە بەرخۆیان و مەردانە شەریانکرد. والی، کە بە جەسارەتی هەورامییەکانی زانی، بە پەلە ڕوویکردە ئەو مەیدانە. سەربازە تایبەتەکانی خان ئەحمەد خان پەنایان بردە بەر (..؟)[٥٥] ناوچەکە. لەم شەرەدا ٢٤

کەس لە هەورامییەکان کوژراو ٤٧ کەسیش بریندارو دیلکران. ٦ سەربازیش لە لەشکری والی کوژران و ٤ کەس بریندار بوون. هەر ئەو شەوە، حەسەن سولتانی هەورامی لەگەڵ پاشماوەی تایەفەکەی خۆیدا هەڵاتن بۆ شارەزووری خاکی دەولەتی عوسمانی. پاش هەڵاتنی ئەوان، والی ماڵ و حالی هەموو ئەو کۆمەلە یاخییە هەڵاتووەی ویرانکرد.

لە لای هەورامانی (لهۆن)یشەوە، نەجەفعەلیخان لەگەڵ سوپاکەی خۆیدا، لە ئاوی سیروان پەرییەوەو پەلاماری گوندی لهۆنی‌دا کە مەلبەندو بنکەی محەمەد سەعید سولتانی هەورامی و تایەفەکەی بوو. پاش شەرو پەلاماریکی زۆرو چەندین شەرو پیکدادان، بە سەریاندا سەرکەوت و (نقود)[٥٦]ی گرت کە پایتەختی ئەوان بوو. پاش دوو رۆژ، هەوالی فیتنەگەریی تایەفەی (بابییە)[٥٧] وهەیبەت شکاندنی شاهەنشای ئیران لەو سنوورەدا بلاوبۆوە، کۆمەلیك لە خراپەکارانی سەرسنوور، بە بیستنی ئەم هەوالە ناخۆشە، دایانە پاڵ هەورامییەکان و لەناکاو پەلاماری سوپاکەی نەجەفعەلیخانیان دا. سەربازەکان ئەو شەوە تا بەیانی مەردانە خۆیان راگرت. لە بەیانیشەوە تا پاش نیوەرۆ، هەولیان دا بەرگری بکەن. لەم نەبەردەدا (٧٠) کەس لە سەربازانی دەولەت و (٢٦) کەس لە تفەنگچییە چریکەکان کوژران. کاتیك کە تاریکی شەو ئەم دوو سوپایەی لەیەك جیاکردەوە، نەجەفعەلیخان وای بە باش زانی سوپاکەی خۆی بکشینیتەوە دواوە، تا لە لایەن غولامشاخانی والییەوە یارمەتی پیبگات. لەبەرئەوە (نقود)ی چۆلکردو سەربازەکانی هینا بۆ خاکی جوانرۆ.

محەمەد سەعید سولتانیش لە دەست زەبرو زەنگی والی لەو دەوروبەرە خۆی نەگرت و پەنای بردە بەر خاکی دەولەتی عوسمانی. والی کە بەمەی زانی پاش ریکخستنی هەورامانی تەخت چووە ناوچەی مەریوان و لەوێ لەگەڵ پاشای سلیمانی کەوتە وتوویژ بۆ گیرانەوەی هەورامییە یاخیبووەکان. لە لایەن پاشای سلیمانییەوە عەزیز ئاغای موتەسەریف و (نقیب الاشراف) هاتن بۆ لای والی بۆ تکاکردن و داوای لیبوردنی والی لە حەسەن سولتان و محەمەد سەعید سولتان و، سێ هەزار تمەن زیریان

پیشکەشی والی کرد. والی چـاوی لـە کـردەوەو تاوانـەکانیان پۆشـی و ریگـەی دان بگەرینەوە شوینی خۆیان، لەم نیوانەدا تەتـەری تایبـەت لـە تارانـەوە هـات و مـوژدەی سەلامەتی گیانی پیرۆزی شای ئیرانی بە والی گـەیاند، بـەم بۆنەیـەوە شـەو ئاهـەنگیکی سازکردو یانزە تۆپی شوکرانەی سەلامەتی گیانی پیرۆزی شـەهریاری عەجـەم تـەقینرا. رۆژی دوایی سوپاکەی بەرەو سنە بەریخست. پـاش هـاتنی بـۆ سـنە هـەموو خـەلك بـە بۆنەی سەلامەتی گیانی پاشاوە جەژن و ئاهەنگیان گیراو بە خۆشی و شادی رۆژگاریان بردە سەر. لە بـەهاری سـالی (١٢٦٨)ی کۆچیـدا خیلـی جـاف کـە لـە نیـوان دەولـەتی ئیران‌و عوسمانیدا ناکۆکییان لە سەرە، دەسـیان دایـە خراپـەکاری‌و ئـاژاوە نانـەوە لـە سـنوری ئـیراندا، لـەناو کوردسـتانی سـنەدا ئـازاری خـەلکیان ئـەدا. والی روخسـەتی تـەمیکردنیانی لـە دەولـەت وەرگـرت و سـوپایەکی کۆکـردەوەوە کـە پـتر لـە سـێ هـەزار سوارەو پیادە بوو، بە ئەمری دەولەت فەوجی (گەروس)یـش نـیردرا بـۆ کوردسـتان بـۆ ئـەوەی لـە تـەمیکردنی جـافدا ببنـە هاوکـاری. والی بـە سـوارەو تفـەنگچی چریـك و تۆپخانەوە کەوتەرێ‌و چوو بۆ (تورسی کـانون) کـە نزیکـی هەوارگـەی جافـەکان بـوو و لەوێ مایەوە، خان ئەحمەد خانی سەرهەنگ و ئیسماعیل خان و نەجەف عەلی خانیشی لەگەڵ دە دەسـتە سـەربازو سـوارەی مـەنمی و سورسـورو کشـکی و لەگـەڵ تفـەنگچی چریکی جوانرۆو خەلکی تردا نارد بۆ لای مەریوان، بۆ ئەوەی ئەم خیلـە خراپـەکارە لـە ناوبەرن و تالانیان بکەن، خان ئەحمەد خان و ئیسماعیل خان و نەجەف عەلی خـان زۆر بە پەلە لەگـەڵ سـوپاکەیاندا پـەلاماری جافـەکانیان داو یاخیبوونەکـەیان سـەرکوتکرد. فـەوجی گەروسـیش (توریزخـاتون) خـۆی گـەیاندە سـوپای والی. ئینجـا والی لـە لای (سارال)ەوە دوای جافەکان کەوت و ئەو خیلە هەرچەند پتر لە دە هەزار کەس دەبـوون توانای بەرگری کردنیان نەبوو و رایـانکرد، خـان ئەحمـەد خـان و ئیسـماعیل خـان لـەو هیرش و پەلامارەدا نزیکەی (٣٠) کەس لە پیـاوە گـەورەکانی جافیـان بـە دیـل گـرت و کوشتیانن و، نزیکەی (٣٠) هەزار سەر ئاژەڵ و مەرو مالاتیان بە تالان دەسکەوت. والی

و خەلکەکە بە دلشادی گەرانەوە بۆ سنە، ئەم سەفەرە دوو مانگ و بیست و دوو رۆژی خایاند. فەوجی (گەروس) لەم سەفەرەدا بە تەواوی پابەندی یاسا بوون و بە ریکوپیکی هاتن و بە ریکوپیکی گەرانەوە. پاش ئەم رووداوە والی دەسەلاتی تەواوی پەیداکردو بە ئارەزووی خۆی فەرمانرەوایی دەکرد. لە سالی ١٢٧٣ کۆچیدا میرزا عەبدولسەمەد ناویك کە خەلکی هەمەدان بوو و یەکیك بوو لە خەلیفەکانی (حاجی محەمەد کەریم خان)ی کرمانیو سەر بە ریبازی ئایینی (شیخیە) بوو، هات بۆ کوردستان و لەگەل والیدا پیکەوە کەوتنە بلاوکردنەوەی ئەم ریبازە. زانایانی ناوچەکە کە هەموویان سوننیو لەسەر ریبازی شافیعین، هەرچەندیان کرد نەیانتوانی والی لە هاورییەتی میرزا عەبدولسەمەد پەشیمان بکەنەوەو هەرچییان کرد بیسوودو بیئەنجام بوو، ناچار دەسکرا بە خۆئامادەکردن بۆ شۆرش و راپەرین، تا لە رۆژی چوار شەممەی شانزەی مانگی رەبیع لئەوەلی سالی ١٢٧٣ی کۆچیدا زاناو پیاوماقوول و کاسبکارانی کوردستان چوون بۆ گۆرستانی شیخان کە دەکەویتە دەشتیکی فراوان لە خۆراوای شاری سنەوە، لەوێ کۆبوونەوە بۆ راویژو وتوویژکردن، پاش کۆتایی کۆبوونەوەکە، پەیامیان نارد بۆ والی کە یا دەبێ ئەو میرزا عەبدولسەمەدە شاربەدەر بکات و لەم ویلایەتە نەمینێ، یاخود خەلکەکە ولات بەجیدیلن، والی گویی نەدا بە داواکەیان و جیبەجیی نەکرد لەم نیوانەدا کۆمەلیك ئاژاوەگیرو خراپەکارو دەرویشی ناوشار بەبێ رەزامەندی زانایان پەلاماری بازارو کاروانسەرایان دا کە شوینی بازرگان و خەلکی سەر بە ریبازی (شیخیە) بوون و دەستیان کردە کوشتنی خەلك و تالانکردنی مالی بازرگانان. کاتیك والی بەمەی زانی دوو تۆپی بردە سەر قەلای حکومەت کە بەسەر بازارو کاروانسەرادا دەیروانی، بۆ ئەوەی بە زۆری چەك مەسەلەکە چارەسەر بکات، کاتیك خراپەکارەکان هەستیان کرد رووبەرووی مەرگ دەبنەوە دەستیان لە تالانکردن هەلگرت و هەریەکە بە لایەکدا رایانکرد. نزیکەی چل کەسیکیان بە کەلوپەلی تالانییەوە تووشی پیاوانی والی بوون و گیران و بە فەرمانی والی لووت و گویی هەموویانیان بریو لە قەلاکەوە فریدرانە

خوارەوە. شیخ عەبدولقادر کە یەکێك بوو لـە زاناکـانی ئـەم شـارە، هـەمان ڕۆژ لەگـەڵ کەسوکاری خۆیدا بەرەو دەولەتی عوسمانی کۆچیکرد. کـاتێك والی بـۆی دەرکـەوت کـە بارودۆخەکە بە دلی خۆی کەوتووەتەوە کۆمەلیکی گرت و هەندیکی تری ئازاردا، لەوانـە ئاغـا مسـتەفا نـاوێك کـە کـوری حـاجی شـەعبان بـوو و یـــە کیـك بـوو لــە ســەرۆکی کاسبکارەکان کرا بە لوولەی تۆپەوە، شیخ وەسیم ناویکیش کە بە شیخ وەسیمی بازار بەناوبانگ بوو، والی چاوی دەرهیناو کردی بە پەند بـۆ خـەلکی تـر، بـری هەشـتا هـەزار تمەنی لە خەلکی شـار وەرگـرت لـە سـزای ئـەم کـارەی خراپـەکاراندا. لـە مـاوەی یـەك حەفتەدا ویلایەت ئارام بوویەوەو ئارامی گەرایەوە ناوشار. ئەم ئاژاوەیە لــە کوردسـتاندا بە شەری کاروانسەرا بەناوبانگە. لـەم هەرایـەدا کۆمـەلیك لات کـەوتن و هیچیـان نـەماو تاقمیکیش لە راورووتی بازارو مالان سەروەت و سامانیان کەوتە دەست، لەوانە حــەبیب الله و باباخان کە دوو برا بوون و ئیسـتا نزیکـەی دوو سـەد هـەزار تمـەن مولـك و پـارەو شتومەکیان هەیە، سەرچاوەی بنەرەتی ئەم داراییەیان لە سـامانی ئـەو بازرگانانەوەیـە کە تالان کران، لەو شەرەدا کاروانسەرا کەوتە دەست ئەوان.

لە سالی ١٢٧٥ی کۆچیدا شەهریاری ئیران بۆ سەیران و گەشت لە ریی هەمەدانـەوە هات بۆ کوردستان و تا لەگەڵ سوپای دەولەتدا نەگەیشتە ناو خاکی کوردستان، کــەس بەم هاتنەی شاهانەی نەزانی، پاش ئاگاداربوونەوەی خەلکی ویلایەت لەگـەڵ والیـدا زۆر بە پەلە چوون بۆ پیشوازی و لە ناحیــەی (ئەسـفەند ئابـاد) شـەرەفی چوونـە خزمـەتی شاهانەیان پیبراو لەگەڵ شەهریاری ئیراندا بەرەو سـنە کەوتنـەرێ. مـانگی (ذی القعـدە الحـرام)ی سـالی (١٢٧٥)ی کۆچـی خیوەتـی شـاهانەیان لـە بـاخی (خەسـرەو ئابـاد)دا دامەزراندو شــەهریاری ئـیران بـە شـکۆوە لـەوێ دابـەزی، هـاورێو یـاوەرانی ئـەو پاشـا دانایە، لە دەوروبەری باخی خەسرەو ئاباد جیگیر بوون، حەزرەتی (ناصر الدیـن) شـای شــەهریاری ئـیران رۆژی دووهـەمی سـەفەرەکەی بـە گـەران بـە نـاو قـەلای حکومـەت و مزگەوتی (دار الاحسان)دا بەسەربرد کە یەکیکە لە بیناکانی (امان الله) خانی گەورە کـە

ساڵانە (٥٠٠) تمەنی بۆ چاککردنەوەی ئەم بینایە تەرخانکردبوو بەڵام بە داخەوە کاربەدەستانی کوردستان لە ماوەی ئەم سی–چل سالەدا هیچ پارەیەکیان بۆ چاککردنەوەی ئەم بینایە سەرف نەکردووە، ئیستا هەموو بیناکە ویران بووەو تیکچووە. بەهەرحاڵ پاش سێ رۆژ حەوانەوە سوپای مەزنی شەهریاری عەجەم لە ریگەی گەروسەوە بەرەو ئازەربایجان کەوتەرێ. لەم سەفەرەدا ئەندامانی سوپا خۆشیان رانەبوارد، چونکە نان و ئازوقە ئامادەنەکرابوو، کاوجۆ بە زەحمەت دەستدەکەوت.

والی لە بری گەنم و جۆ زیری دەبەخشیو قەبوول نەدەکرا، هەر ئەم مەسەلەیە پاش دە مانگ بوو بە هۆی لەسەرکارلابرانی والی. لەم رۆژانەدا (عومەر پاشا)ی سەردار ئەکرەمی دەولەتی عوسمانی هاتە سەر سنوورەکانی کوردستان بۆ بینینی والی. والی پاش وەرگرتنی روخسەت لە دەولەتی ئیران بە ریکوپیکیو ئامادەکارییەکی شایانەوە بەرەو مەریوان کەوتەرێو لەسەر سنوری هەردوو دەولەت ئەم دوو سەردارە یەکیان دی. پاش بەجیگەیاندنی کارو ئەرکەکانیان هەردووکیان گەرانەوە بەرەو وڵاتی خۆیان.

لە ناوەراستی مانگی شەعبانی (١٢٧٦)ی کۆچیدا کە سەرەتای بورجی (حمل) بوو، میرزا (ابو القاسم)ی تەفریشی خەزنەداری دیوان وەزارەتی کوردستانی پیبەخشراو هاتە سنە، میرزا محەمەد رەزای وەزیریان لە وەزارەتی کوردستان لابردو بانگیان کرد بۆ تاران، پاش مانگیك والیش لەسەرکار لابراو (نەجەفعەلی خان)ی ئامۆزای کە لەو کاتەدا حکومەتی جوانرۆی بەدەستەوەبوو، بوو بە جیگری حکومەت (نائب الحکومە). غوڵام شاخانی والی پاش لابرانی لەگەڵ ماڵ و منداڵ و پیاوەکانیدا چوو بۆ تاران. لەملاوە نەجەف عەلی خان هاتە ناوشاری سنەوەو پاش دوو مانگ فەرمان و خەڵاتی حکومەت بە ناوی ئەوەوە دەرچوو، بۆ ئەوەی لەگەڵ میرزا ابو القاسمی وەزیردا کاروباری حکومەت و کۆکردنەوەی باج و خەراج بەریوەبەرن. ئەم نەجەف عەلی خانە گویی گران بوو لەگەڵ ئەوەشدا زۆر زیرەك و بیرتیژ بوو، ساڵانی بە

ئاواتی حکومـەتی کوردسـتانەوە دەبـردە سـەر تـا بـە ئـیرادەی یـەزدانی بـە توانـا بـەو ئاواتەی خۆی گەیشت، یەك سـالی تـەواو فـەرمانرەوایی کـرد، لـەو یەکسـالەدا ئـاوریکی باشی دایەوە لە کۆمەلیکی زۆر لە وەجاخزادەو هەژارو خیزانە کۆنەکانی شار کە رۆژگار بارودۆخی تیکدابوون. ئـەم نەجـەف عـەلی خانـە هـەرچی زیریکـی لـە کـاتی حکومـەتی جوانرۆدا کۆکردبووەوە لە ماوەی ئەم سـالەدا بـۆ پیویسـتییەکانی کوردسـتان خـەرجی کرد. ئەو بیچارەیە لە کۆتایی سالەکەدا بە دەستی بەتالەوە لەسـەرکار لابـراو چـوو بـۆ تـاران لـە تـاران پلـــەی ســـەرۆکی پاســـەوانەکانی حـــەزرەتی (مظفـر الدیــن مــیرزا)ی وەلیعەهدی دەسکەوت و چوو بۆ ئازربایجان، پاش سالیك ئەم جیهانە کۆتایی هاتووەی بەجیهیشت و چووە بارەگای یەزداندان. پاش لابرانی نەجەفعەلی خان غـولام شـا خـانی والی دووبـارە حکومـەتی کوردسـتانی پیبەخشـرا. لـە (٢٣)ی رەمـەزانی (١٢٧٧)دا ئـەم هەواڵە گەیشتە کوردستان. لە (٥)ی مانگی شەوالی هەمان سالدا بـە فـەرمانی شـاهانە، غولام شاخان حوسین قولی خانی کوری کـردە جیگـری ویلایـەت و لەگـەڵ کۆمـەلیك لـە کوردستانییەکاندا ناردی بۆ کوردستان، والی خۆیشـی لـە مـانگی (ذی العقـدة الحـرام)ی هەمان سالدا لە تارانەوە بەرەو مەلبەندی حکومەتەکەی خۆی کەوتەرێ، لە ناوەراسـتی هەمان مانگدا هاتە ناو شاری سنەو دەستیکرد بە کاروباری حکومەت، سێ سالی تـەواو بەوپەری دەسەڵاتەوە رۆژگاری بە فـەرمانرەوایی بردەسـەر. لـە سـالی ١٢٨٠ی کۆچیـدا مەلا فەتح اللەی قازیو مەلا محەمەد ئەمینی (امین الاسلام) و مـەلا لطیـف اللـەی شـیخ الاسلامی ئیستاو مەلا محەمەد سالحی (فخر العلماء)، لەگەڵ کۆمەلیك لە پیاومـاقووڵانی کوردستاندا لەسەر لابردنی والی ریککەوتن و بوون بە هاوپەیمان و لـە شـیوەی هـەڵاتندا چوون بۆ تاران و شکایەتیان لە رەفتاری خراپی والیو میرزا محەمەد رەزای وەزیـر کـرد بەرامبەر بـە خـەلکی کوردسـتان. شاهەنشـای دانـاو هۆشـیار تەنـها لەبـەر ئاسـوودەیی خەلکی کوردستان بـاجی سـەر کوردسـتانی کـەم کـردەوەو بـە نـاوی هـەر گوندیکـەوە فەرمانیکی دەرکردو بە فەرمانی ئەو پاشا رەعیەت پەروەرە، مـیرزا زەکـی خەزنـەداری

دیوان کە نازناوی (نائب) بوو کرا بە وەزیری کوردستان و یــاریدەدەری غـولاّم شـاخان. کە میرزا زەکی گەیشتە کوردستان بەوپەری بێ تەماعییــەوە کاروبـاری هــەموو خــەلکی کوردستانی رادەپەراند، لە دادپەروەریو بیتەماعی ئەم پیـاوە وەجاخزادەیـە رەعیـەت شـادو ولایـەت ئـاوەدان بـوو، لـە ســالی دووهــەمی ویلایەتەکــەیدا واتــە ســالی ١٢٨١ هەورامییـەکان دەسـتیاندایە ئـاژاوە نانـەوەو یــاخیبوون، مــیرزا زەکــی ئــەم ئــاژاوەو یاخیبوونەی پی قــەبوولّ نـەکراو مەسـەلەکەی گـەیاندە دەربـاری دەولـەت. شـەهریاری تـاجدار غـولاّم شـاخانی والی کـردە بەرپرسـی سـەرکوتکردنی ئـەو یاخیبووانـە. والی لــە ماوەیەکی کەمدا خەلکیکی زۆری کۆکردەوەو لەگەلّ تیپـی (ظفـر)ی کوردسـتان و چـوار تۆپ و ئاگرهاویژو سێ هەزار تفەنگچی چریـك، لـە ریگـای جوانـرۆوە بـەرەو هـەورامانی لهۆن کەوتەرێ، کە گەیشتە گونـدی پـاوەی کۆتـایی خـاکی جوانـرۆو سـەرەتای خـاکی هەورامان، (علــی اکـبر خـانی شـرف الملـك)ی لەگـەلّ کۆمـەلیك چریـك و چـەند دەسـتە سەربازو سوارەدا کردە پیشەنگی سوپا. (شرف الملك) لەگەلّ سوپاکەی خۆیدا دلیرانــە روویکردە کەناری ئاوی سـیروان کـە لـەو شـوینەدا بـە (برمـیردی) بەناوبانگـە. هــەر بـە گەیشتنی لەگەلّ کۆمەلیك هەورامیدا کە لەوبەری رووبارەوە لـە لایـەن محەمـەد سـەعید سـولتانەوە کرابوونـە قــەراولّ کەوتـە شـەرەوە، تفەنگچییـە هەورامییـەمکان بەرگــەیان نەگرت و هەلاّتن. شرف الملك بە مەبەست گەیشت و سوپاکەی خۆی لە ئاو پەراندەوەو خیرا هەوالەکەی نارد بۆ والی، والیش بیدرەنگ هیزەکـەی خسـتەرێو خۆیگـەیاندە علـی اکبر شرف الملك. محەمەد سەعید سولتان کە زانی شەرکردن لەگەلّ ئەم هیزەدا دەبیتە مایەی شکان و رسوایی، نەوسوودی چۆلکـرد کـە ناوچـەی حکومەتەکـەی بـوو، لەگـەلّ دەستوپیوەندەکانیدا چوو بۆ شارەزوور کە خاکی دەولــەتی عوسمانییـەو پـەنای بـردە بەر مالی شیخ عەلی ئـەبا عوبیـدەو ماوەیـەك بـە هـەلاّتوویی مایـەوە. سـوپای دەولـەت ئـالاّی لـە نەوسـود هـەلکرد، پـاش سـێ مـانگی تـەواو محەمـەد سـەعید سـولتان شـیخ عبدالرحمن –ی کوری شیخ عوسمان کـە سـەرۆکی نەقشـبەندییەکانە، لەگـەلّ محەمـەد

پاشای سەرۆکی خیلی جافی لای والی کردە تکاکاری خۆی. شیخ عبدالرحمن و محەمەد پاشای جاف محەمەد سەعید سولتانیان هینا بۆ تەویلەکەی والی و پاش وەرگرتنی سێ هەزار تمەن سزا والی محەمەد سەعید سولتانی بەخشیو وەکو جاران کردیەوە بە حاکمی هەورامانی لهۆن و بەرەو سنە گەرایەوە. بەندە کە نووسەری ئەم لاپەرانەم لەم سەفەرەدا بەرپرسی کاروباری نووسین و سکرتیری خودی والی بووم و ئەم مەسەلانەم بە چاوی خۆم دیوە، والی لە گەرانەوەیدا بەر لوتفی شاهانە کەوت و جلوبەرگی گرانبەهاو نازناوی (ضیاء الملك)ی پیبەخشرا. لە سالی ١٢٨٢ی کۆچیدا لە لایەن دەولەتەوە فەرمان دەرکرا لە ناوچەی مەریواندا کە سنووری دەولەتە، قەلا دروستبکریت. ئەندازیاریك هات بۆ کوردستان بۆ دەستنیشانکردنی شوینی قەلاکەو دیاریکردنی بری ئەو پارەیەی تییدەچێ. پاش ئامادەکردنی کەرەستەی پیویست، لە ماوەی شەش مانگدا قەلاکە بەوپەری پتەوی و قایمییەوە تەواوکراو ناوی لینرا (قەلای شاە ئاباد).

لە کۆتایی سالی ١٢٨٣ی کۆچیدا غولام شاخان و میرزا زەکی وەزیر پاش وەرگرتنی ئیجازە لە دیوانی دەولەت چوون بۆ تاران، والی پاش مانگیك لە تاران نەخۆش کەوت، نەخۆشییەکەی سەخت بوو حەکیم (تولوزانی) فەرەنگی کە حەکیمی تایبەتی شەهریاری ئیران بوو کەوتە تیمارکردنیو کەمیك باش بوو. لەم کاتەدا کەژاوەی شەهریار بەرەو ناوچەی خوراسان کەوتەرێ، والی و میرزا زەکی بە فەرمانی ئەو پاشا دل ورییە گەرانەوە بۆ کوردستان، پاش ماوەیەك والی تووشی نەخۆشییەکە بوویەوەو سێ مانگ لە جیدا کەوت و هەرچی دەرمانیکی دەدرایە هیچ سوودیکی نەبوو تا لە ریکەوتی رۆژی سێ شەممە نۆی جمادی الثانی سالی ١٢٨٤ی کۆچیدا، ئەم دنیایەی بەجیهیشت.

ئەم (ئەمان الله خان)ی والیە لەبەر ئەوەی لە حەرەمسەرای خوالیخۆشبوو سولتان فەتحعەلی شادا لەدایك بووبو، ئەو خاقانە بەهەشتییە گویی سمی بوو و ئەلقەی غولامی

کردبووە گوێی و نازناوی غوڵام شاخانی لینابوو لەبەرئەمەیە کە هەم پێی دەڵین ئـەمان الله خان و هەم پێشی دەڵین غوڵام شاخان. بەهـەرحاڵ ئـەم ئـەمان الله خانـە کەسـێکی کـامڵ و پێگەیشـتوو و بـیرتیژ بـوو، رەوشـتی چاکـەی زۆر تیدابـوو، شـەرمنیو سـەبرو تەحەمولی لە رادەبەدەر بوو، حەکیم و بەخشندە بوو، بە گشی بیسـت سـالی تـەواو لـە کوردستاندا فەرمانرەوا بوو، ئـەو کەسـانەی ئیسـتا نـاوو ناوبانگیکیـان هەیـەو خـاوەنی پلەوپایـەو دەسـەڵاتن، هـەموویان پـەروەردەو بەرهـەمی نیعمـەتی ئـەون، مزگـەوتی (دارالاحسان) کە بینایەکی بەرزە یەکیکە لە بیناکانی ئەو، لە ماوەی ژیانیدا زۆر حـەزی لـە کۆکردنـەوەی کتیـب و کرینـی مولـك هـەبوو. پـتر لـە دوو هـەزار بـەرگ کتیـب لـە کتیبخانەکـەیدا بـوو، هـەروەها پـتر لـە پـەنجا پارچـە مولکـی بـەپیتی کوردسـتانی بەدەستهیناوە، لەگەڵ ئەوەشدا لە کاتی مردنیدا نزیکەی (٨٠) هەزار تمەن قەرزار بـوو، پـاش مردنـی، ئـەبو طـالبی بازرگـانی ئەسفەهانی لـە مـاوەی شـەش سـالدا هـەموو قەرزەکانی لە بەرهەمی مولك و میراتییـەکانی دایـەوە. سـی کـورو سـێ کچـی لـە پـاش بەجیما، ئیستا هەموو کورەکانی بە دەستی بەتاڵ و لەوپەری پەریشانیدا ژیـان دەبەنـە سەر، حوسین قولی خانی کورە گەورەی کە بە خانی خانان بەناوبانگە، نزیکەی هـەزارو سـی سـەد تمـەن لـە دەولـەت وەردەگریت، لاویکـی مـاقوول و بـی ئـازارو زیانـە، ئـەم مووچەیە کە لە دەولەت وەریدەگریت بەشی ژیانی ناکات. بەهەرحاڵ پاش مردنـی امـان الله خانی والی، میرزا زەکی وەزیر هەولیکی زۆری دا بـۆ ئـەوەی ئـەم (خـانی خانـان)ەی کوری بکاتـە فـەرمانرەوای کوردسـتان، بـەڵام هەولـەکانی لای کاربەدەسـتانی دەولـەت سـوودی نـەبوو. فـەرهاد مـیرزای (معتمـد الدولـە)ی مـامی شـەهریاری ئـیران کرایـە فـەرمانرەوای کوردسـتان. پـاش پۆشـینی بـەرگی فـەرمانرەوایی و بەدەسـتهینانی حکومەت تووشی نەخۆشی خوینی لووت بەربوون بوو، ئەم نەخۆشییە ریگەی نەدا بیتە کوردسـتان. معتمـد الدولـە خۆیشـی ئـەم فەرمانرەواییـەی بـە شـووم لـە قەلـەم داو وازیلیهینا، دووبارە مـیرزا زەکیـان کـردەوە بـە جیگـری حکومـەت، پـاش سـێ مـانگ

فەرهاد میرزای معتمد الدولـە بـە تـەواوی چـاك بوویـەوەو بـۆ جـاری دووهـەم لـە لایـەن دەولەتـەوە کـرا بـە فـەرمانرەوای کوردسـتان و لـە ریگـەی هەمەدانــەوە بــەرەو ســنە کەوتەریّ. میرزا زەکـی و حوسـین قـولی خـانی خـانی خانـان لـە ریگـەی (گـەروس)ەوە روویـانکردە تـاران. معتمـد الدولـە رۆژی هـەینی چـواری مـانگی (ذی القعـدة الحــرام)ی ١٢٨٤ی کۆچی چووە ناو (دار الایالە)ی سنەوە. کاتیّ لە تارانـەوە کەوتـەری، محەمـەد عەلی خانی کوری خوالیخۆشبوو رەزا قولی خانی والی کە خۆشکەزای خـۆی بـوو، کـردی بە سەرهەنگی فەوجی کوردستان و خۆی هینایەوە بۆ کوردسـتان، ئـەم محەمـەد عـەلی خانە لەکاتی نووسینی ئەم باسـەدا پلـەی (مـیرپنج)[٥٨] و نازنـاوی (ظفـر الملـك)ە ئـەو خزمەتانەی لە پیناوی دەولەتدا کردوویەتی بووەتـە مایـەی بەرزبوونـەوەی و انشـاء الله لیرە بەدواوە دەیاننووسینەوە.

## باسی فەرمانرەوایی فەرهاد میرزای ( معتمد الدولە ) لە کوردستاندا

شـازادە معتمـد الدولـە، رۆژی چـواردەی ذی القعـدەی ١٢٨٤ چــووە دار الایالــەی سـنەوە. هـەر لــەو رۆژەدا هــەموو پیاومــاقووڵ و گــەورەپیاوانی کوردســتان چوونــە خزمەتی، پاش تـەواوبوونی ریورەسمـی ئاسـایی، وتـاریکی خوینـدەوە کـە پوختەکـەی ئەمەیە: من فەرمانرەوای ئەم ویلایەتەم، درۆ لەگەڵ کەس ناکەم، نابیّ کەس لە ئیوەش درۆم لەگەلدا بکەن، درۆی هەر کەسـیکم بـۆ دەربکـەویت دەردەکریـت. لـە راسـتیدا لـە ماوەی شەش سالی حکومـەتی ئـەودا راسـتگۆیی بـرەوی هـەبوو. پـاش سـیّ مـانگ بـە مەبەستی سەردان و بەسەرکردنەوەی قــەڵای شـاە ئابـادی مـەریوان لەگـەڵ کۆمـەلیکی بچووکدا، روویکردە سنووری ناوچەی مەریوان. کە گەیشتە مەریوان حەسـەن سـولتانی هەورامی کە سالەها لە حاکمەکانی کوردستان یـاخیبوو لەگـەڵ بـەهرام بـەگ و مسـتەفا بـەگی بـرایو هـەزار تفـەنگچیدا هاتــە خزمــەتی معتمــد الدولــە، معتمــد الدولــە ئــەو قەرەبالغییەی دەوری حەسەن سولتانی لاپەسەند نەبوو و پیی نارەحەت بوو. هەر ئــەو

ڕۆژە تفەنگچییەکانی حەسەن سولتان چەندین ڕەفتاری وەحشییانەیان نواند، تا گەیشتنە گوندی (بلیك) کە یەکیکە لە گوندەکانی مەریوان و لە سنوورەوە نزیکەو لەوی دابەزین، معتمد الدولە لە مزگەوتەکە نیشتەجێ بوو، ئەو شەوەیان لەوێ بەسەربرد. بۆ بەیانی معتمد الدولە سەردەستەی خزمەتکارەکانی کە (زین العابدین) ناویك بوو بانگکردو نەخشەو پلانی بۆ دانا کە بیئەوەی کەس بزانێ چوار- پینج خزمەتکاری جەللاد لە قاوەخانەوە بەریت بۆ مزگەوت و ئامادەیان بکات. هەرکە حەسەن بەگ و هەردوو براکەی دینە لای معتمد الدولە، ئەم دەیاننیرێ بۆ قاوەخواردنەوە، هەرکە گەیشتنە قاوەخانە، هەرسێ براکە زنجیر بکەن و یەکسەر حەسەن سولتان بخنکینن. لەسەر فەرمانی شازادە سەردەستەی خزمەتکارەکان هەموو پیویستیەکانی کوشتن و بەستنەوەی ئامادەکردو بە پیی نەخشەکەی شازادە جوولایەوە. هەموو تفەنگچییەکانی حەسەن سولتان لە دووری بیست هەنگاو ریزیان بەستبوو و چاوەریی هاتنەدەرەوەی ئەویاندەکرد. پاش کوشتنی حەسەن سولتان، بە فەرمانی شازادە گوریسیان بەست بە پییەوەو رایانکیشایە دەرێو بردیانە ناو تفەنگچییەکانەوە. ئەم هەزار تفەنگچییە بە بینینی تەرمەکەی حەسەن سولتان هەلاتن و بلاوەیان لیکرد. پاش کوشتنی حەسەن و زنجیرکردنی براکانی، شازادە گەرایەوە بۆ سنە. ئەم کردەوەیەی شازادە بووە مایەی سەرسوڕمان و ساملینیشتنی خیلو تیرەکانی سەر سنوورو هەموو خەلکی کوردستان. بە هەرحال هەورامییەکان بە هیوای ئەوەی کە بەلکو دوو براکەی حەسەن سولتان لە زیندانی شازادە ڕزگاریان ببێ ملیانکەچکرد. ماوەی یەك سالی تەواو هەرچی دیارییەکیان پیشکەش کردو پەیمانی خزمەتگوزارییان دا لای حەزرەتی شازادە قبولنەکرا. بۆیە کەوتنە سەرخەیالی یاخیبوون و ڕووبەڕووبوونەوەو کەوتنە خۆئامادەکردن.

لە زستانی ئەمسالدا قەلای شاە ئابادی مەریوان لەبەرچاودیری نەکردنی ویرانبووبوو، دووبارە لە لایەن دەولەتەوە فەرمانی چاککردنەوەی دەرچوو. معتمد

الدوله، محەمەد باقرخانی کورەزای محەمەد حوسێن خانی سەدری ئەسفەهانی کردە فەرمانرەوای مەریوان و ناردی بۆ چاککردنەوەی قەڵای شاه ئاباد. هەورامییەکان کەوتنە خەیالی ئەوەی محەمەد باقرخان بگرن و بیبەن بۆ هەورامان و لەبری دوو براکەی حەسەن سولتان زیندانیی بکەن. محەمەد باقر خان ئەم هەواڵەی پێگەیشت و کەوتە خۆپاراستن و حەزرەتی شازادەیشی لەم پیلانە ئاگادارکرد. شازداه بیئەوەی مەبەستی خۆی ئاشکرا بکات رۆژی هەینی ٢٣ی (محرم الحرام)ی سالی ١٢٨٦ی کۆچی لە سنەوە بەرەو مەریوان کەوتە ری و ژمارەیەکی کەم لە کوردستانییەکان و سەد سەربازی لەگەڵ خۆیدا برد، لە ریگای گوندی (سوورکەوڵ) کە دەکەویتە نزیکی گوندی (ئەنجومەنە) خیوەتیان هەلدا. هەورامییەکان کە بینییان هەلیان دەسکەوتووەو نیچیرەکە کەوتووەتە داویانەوە، بە شەو نزیکەی هەزار تفەنگچییان خستەرێو لە نزیك سوپای شازادەوە لەسەر گردیك کە بەسەر سوپاکەدا دەیروانی جیگیر بوون و چاوەریی هەلهاتنی خۆریان دەکرد. ئەم هەواڵە لە نیوان گومان و راستیدا گەیشتە ئەو کوردستانییانەی کە لە حوزووری شازادەدا بوون. علی اکبر خانی شرف الملك و میرزا رەزا عەلی دیوان بەگیو کۆمەلیك لە کوردستانییەکان لە خۆیانەوە مەسەلەکەیان خستە بەردەم شازادە، ئەمیش بە هۆی لە خۆبایی بوونەوە ئەم هەواڵەی بە مەحاڵ زانی. هەرچەند کوردستانییەکان سووربوون لەسەر قسەکەیان، شازادە هەر لەسەر کەللەرەقی خۆی بەردەوام بوو. بەم مشتومرە رۆژیان کردەوەو لە کاتی هەلهاتنی خۆردا، شازادە فەرمووی وا رۆژ بوویەوەو هیچ نیشانەیەك لە هەواڵە بیماناکانی کوردستانییەکان دەرنەکەوت. هیشتا قسەکەی تەواونەکردبوو دەنگی تەقەی تفەنگی هەورامییەکان بەرزبوویەوەو تەرزەی بەلا لە لوولەی تفەنگەکانیانەوە دەستی بە بارین کرد، پتر لە هەزار گوللە کەوتە ناو سوپاکەوە. حەزرەتی شازادە کەوتە خۆیو فەرمانی ئامادەباشی سوارەو سەربازی دا. نەیدەتوانی نەنگی هەلاتن بۆ خۆی قبول بکات، جگە لەوەش تەقەی هەورامییەکان گەیشتە خیوەتی شازادە. کوردستانییەکانو

به تایبەت علی اکبر خانی شرف الملك ریگای رزگاربوونیان لــە هــەلاتندا بینـی. شـازادە پاش کوژرانی کۆمەلیك لە یاوەرەکانی ناچار بوو هەلیت و بە دەم هەلاتنەوە شیعریکی عەرەبی بخوینیتەوە کە دەلیّ: هەلاتن نەنگی نیە بۆ کوریك کە تـا دوینـیّ بـە ئازایـەتی ناسراوە". ئەنجا سواری ئەسپەکەی بـوو و لەگـەل عـەلی ئەکبـەر خـانی شـرف الملـك و ژمارەیـەکی کـەم لـە کوردسـتانییەکاندا ریـی هـەلاتنی گرتەبـەر. ئـەو ســەربازانەی لــە سوپاکەدا بوون نزیکەی یەك سەعات بەرگرییان کرد. عباس مـیرزا سـولتان و محەمەـەد بەگ و ژمارەیەك لە ســەربازەکان کـوژران. خـەلکی سـوپاکە سـەریان لیشـیواو ئـەوەی توانی هەلات و ئەوانی تریان کـوژران یـا گـیران. لـەم رووداوەدا سـیو شـەش کـەس لـە خـەلکی کوردسـتان و خزمـەتکارەکانی شـازادە کـوژران (علـی ئەکبـەر خـانی شـەرەف الملك)یش بریندار بوو، هەر مال و کەلوپەلو پارەو شتیك لـە سـوپاکەدا هـەبوو بـوو بـە نسیبی هەورامییەکان. بەهەرحال شازادەو یاوەرەکانی تـری لـە شـەوو رۆژیکدا خۆیـان گـەیاندەوە سـنە. شـازادە لـەم نـەنگ و عـارە وەکـو مـار گینگلـی دەخـوارد. دریـژەی رووداوەکەی بە دەسەلاتدارانی دەولەت راگەیاند. شەهریاری تاجدار بەم هەواله شـلەژاو فەرمانی دا سوپای پرچەك و سەرکردە بە تواناکان بکەونەریّو هەورامییەکان تیکوپیـك بشـکینن و لـەناویان بـەرن. بـۆ ئـەم مەبەسـتە دوو تیـپ سـەربازو هـەزار ســوارەو دوو فەوجی هەمــەدانی موسـتەفا قـولی خـانی (ئیعتیمـاد السـلطنە) و یـەك فـەوج سـەربازی ئەفشاری (ورمیّ) ی بیـوك خـانی سـەرتیپ لـە ماوەیـەکی کورتـدا رەوانـەی کوردسـتان کـران، حـاجی قەنبـەر علـی خـانی سـعد الدولـە کرایـە سـەرداری ئـەم سـوپایە. پیــش گەیشـتنی سـوپای دەولـەت محەمـەد عــەلیخانی ســەرهەنگ کــە ئیســتا (مــیرپنج) و (ظفر الملك)ە، فەوجی کوردستان و تفەنگچی سەقزو بانەو مــەریوان و سـیّ تـۆپ و دوو مەنجەنیقی بچوکی بردە شامیان و دەربەندی (کەلەدیّ) کە سەرەتای خاکی هەورامانەو ئەویی کردە قەرارگای سوپاکەی خۆی. لە کۆتـایی مـانگی سـەفەردا قەنبـەر عـەلیخانی (سعدالدولە) لەگەل سەرکردەکانیسوپاکەیدا هاتنە ناو شاری سنە. شازادە بە پیی ئەو

زانیارییانەی کە هەیبوو هێزەکانی دەولەتی کرد بە دوو بەشەوە، بەشێکیان کە بریتی بوون لە دوو فەوجی پیادەو سوارەی نیزامیو هەزار تفەنگچی چریکی ویلایەت لەگەڵ حاجی قەنبەرو عەلی خانی سعدالدولەدا ناردی بەرەو شامیان و هەورامانی تەخت، بۆ ئەوەی پەیوەندی بە سوپای محەمەد علی خانی ظفر الملك هوە بکەن. بەشی دووەمیشیان کە بریتی بوو لە دوو فەوجی سەربازی هەمەدان و یەك فەوج سەربازی ورمێو تفەنگچی چریکی جوانرۆو دوو مەنجەنیقە بچووکەکەی لەگەڵ مستەفا قولیخانی (ئیعتیماد السلطنە) و عەلی ئەکبەر خانی (شرف الملك)و بیوك خانی سەرتیپدا لە ریگەی جوانرۆوە، نارد بۆ سەرکوتکردنی محەمەد سەعید سولتان و گرتنی نەوسوود. کە حاجی قەنبەر عەلی خان لەگەڵ سوپاکەیدا خۆی گەیاندە فەوجی (ظفر) و ظفر الملك، پشویان دا. لە سەرەتای (٥)ی ربیع الثانی شەریکی کتوپر دەستیپیکرد. لەبەرئەوەی شوینی هەورامییەکان سەخت و قایم بوو و بە تەواوی بەدرەخت داپۆشرابوو، سوپای (منصور) دەسکەوتیکی وایان نەبوو، هەورامییەکان سوپاو سەنگەریان هەبوو، دەولەتیش سینەو سەنگەر، لەگەڵ ئەوەشدا بە هۆی کارامەیی (ظفر الملك) و ئاگری تۆپەکانیەوە هەورامییەکان مایەپووچ دەرچوون و ژمارەیەکیان کوژران، لە سەربازەکانی فەوجی (ظفر)ی کوردستانیش هەلۆخانی سولتانی بەنی ئەردەلان و یەك نایب و بیست سەرباز کوژران و بریندار بوون. ئەو رۆژە لە سەرەتای بەیانییەوە تا ئاوابوونی خۆر هێزی دەولەتی مەردانە خەریکی شەربوون، کە تاریکی داهات هەورامییەکان هەلاتن و سوپای سەرکەوتوو گەرایەوە بنکەو شوینی خۆی. لە لای جوانرۆوە کە سوپای دەولەت گەیشتە دەوروبەری رووباری سیروان، محەمەد سەعید سولتان چوار سەد کەس تفەنگچی نارد بۆ بەرەنگاربوونەوەیان و تا ریگانەدەن هێزەکانی دەولەت لە رووباری سیروان بپەرنەوە. تفەنگچییەکانی محەمەد سەعید سولتان لە شوینیکدا کە بەسەر رووبارەکەدا دەیروانی بە نیازی شەر سەنگەریان لیدا، وایاندەزانی کە لەشکرەکە ئەگەر سوپای (سەلم و تووریش) بن تا رۆژی قیامەت

ناتوانن لەو ئاوە بپەڕنەوە، سوپا هەر لە ڕۆژی گەیشتنیەوە هەلمەت دەباو پەلاماردەدات، بەڵام کاتێ ئاوەکە دەبێتە کۆسپ لەبەردەمیا لە بێ ئاوی و نانیدا دەنالینن و سوودیکیان دەستناکەویت.

لە شەوی (٢١)ی ربیع الثانیدا، (ئیعتیماد السلطنه) بیئەوەی بە کەس بلیت سەنگەرەکەی خۆی بردە کەناری ڕوباری سیروان. کە ڕۆژ بوویەوە فەوجی ئەفشاری پییان زانیو غیرەت گرتنی و ئەمانیش سەنگەرەکانیان بردە پیشێو لە کەناری رووباری سیرواندا سەنگەریکی تریان دامەزراند، سەربازەکانی هەمەدان مەلەیان دەزانی، هەردوو فەوجەکە بیئەوەی لە شەپۆل و تۆفان بترسن بە مەلە لەو رووبارە وەك مراوی ناو ئاوو هەلۆی ئاسمان پەرینەوەو ئەوبەربەستەیان بریو لەم دەریای سیروان و کیوی ئاگرپژینە نەترسان. هەر کە لە ئاوەکە پەرینەوە، هەردوو سوپاکە دایان بەیەکداو بوو بە جەنگی مەغلوبە، لەو ناوەدا گوللە نارنجۆك و باروت دەتەقینەوە، گوللە لە ئاسمانەوە ئەکەوتە سەرزەوی.

ڕۆژی (٢٢)ی ربیع الثانی تفەنگچییەکانی هەردوو هەورامان لە بەیانییەوە تا ئیوارە بە مەبەستی نەبەرد هاتبوونە پیشەوە بە سەرشۆری گەرانەوە دواوە، دەستەیەك سەربازی فەوجی ئەفشار کە لە قەڵای کۆساردا سەنگەریان لیدابوو دلیرانەو خۆراگرانە جیگای خۆیان کردەوەو ئەو سەرشۆرانە بە کەوانی شکاوو سەرلیشیواوییەوە کەوتنە هەڵاتن، پاش ئەوە ماوەی دوو ڕۆژیك سوپای هەمیشە سەرکەوتوو بۆ دروستکردنی پردو دۆزینەوەی ریگاو بوار دواکەوت. لە (٢٤)ی مانگی (ربیع الثانی)دا بە شەبیورو بالەبانەوە رووبانکردە نەوسوود، لە ڕێ ڕەحمان بەگ و عوسمان بەگی کورانی حەمە سەعید سولتان هاتن بۆ جەنگ و بە نەنگەوە گەرانەوە، بە لوتفی خواو بەختی درەخشاوەی شاهەنشا، ئاڵای بە مانگ نەخشینراو لە نەوسوود کە پایتەختی هەورامانی لهۆنە هەلکرا. لەم بینەوبەرەدا عەلی ئەکبەر خانی شرف الملك لەگەڵ تفەنگچییە جوانرۆییەکانی خۆیدا لە هەموو شوینیك لە راکەراکەو گەراندا هاوکارو

یاریدەدەری سوپابوون. لە روی حەق و ئینسافەوەو بەبێ زیادەرۆیی نووسەرانە، عەلی ئەکبەر خانی شەرەف الملك بەهۆی جوامێری و ئازایەتی و لیزانیی خۆیەوە زیاتر بووە هۆی ئەم سەرکەوتنە گەورەیەو گیانفیدایی گەیاندە دوا پلەو شایانی ئەوەیە مێژوونوسانی جیهان ناوی لەسەر لاپەرەکانی مێژووی خۆیان بنووسن بۆ ئەوەی بۆ یادگاری بمێنیتەوە، ئافەرین بۆ دەست و بازووی ئەو. لێرەدا لە جێی خۆیدا بوو کە قەنبەر عەلی خانی سعدالدولە سەرداری سوپای شاهی نووسیبووی: ئێمە سێ کەس کاری خۆمان تەواوکرد، ئیستا نۆرەی تۆیە ریشی خۆت بجوولێنە.

لە لای هەورامییەکانی هەورامانی تەختیشەوە هەردوو فەوجی نیزامی لەگەڵ فەوجی (زەفەر)ی کوردستان و تفەنگچی سەقزو بانەو مەریواندا یەکیانگرت و کەوتنە سەر ئەو خەیالەی کوتوپرو بە شەو پەلامار بدەن. ژمارەیەك هەورامی لەگەڵ عبدالرحمن بەگدا کە لە بەگزادەکانی هەورامان بوو و لەوەوپێش لەگەڵ تایەفەی حەسەن سولتاندا دوژمنایەتییان هەبوو، هاتنە لای (ظفر لملك) و داوای مەرحەمەتیان کردو پەیمانی خزمەتگوزارییان دا بە شارەزایی ئەوان و یاریدەی یەزدانیو بەختی سولتانی، شەوی (٢٦)ی رەبیع الثانی، پێنج هەزار سوارو پیادە لەگەڵ سەرکردەکانی سوپادا کە هاتبوون بۆ کوشتن و کوژران لە ریی (سنە) و (مرس)ەوە بە بێ ترس بەو شوێنە سەختەدا سەرکەوتن و وەکو بەڵای ئاسمانی چوونە ناو (دزلی)یەوە. کەس بە خەیالیدا نەدەهات تاکە یەك کەس بتوانیت لەو شەوە تاریکەداو لەو ریگە باریکەوە بروات چ جای سوارەو پیادەو تۆپی دوژمن راوکەر. لە دەنگی شەیپور ئەو خراپەکارە لووت بەرزانە لە خەوی غەفلەت بە ئاگاهاتن. لەبەرئەوەی زۆربەی تفەنگچییەکان بۆ پەراندنەوەی لەشکر لە ئاوی رووباری سیروان بەرەو لهۆن رۆیشتبوون، کاتیك کە بە گیرانی (دزلی)یان زانی بە کۆمەڵ هاتن بە مەبەستی شەرو نەبەرد، لەشکری هەورامی مەردانە کەوتنە شەرو دلیرانە شەریانکرد. بەلام لە بەرامبەر ئەم لەشکرە سەرکەوتووەدا وەك دلۆپە ئاویك بوون بەرامبەر بە دەریا بەلام دیسان بە ئەندازەی

خۆیان شەریانکرد. لەناو دوژمندا شیخ کودو کە کەسیك بوو خۆی کردبوو بـە پیـاوخواو وەك دەهـۆڵ دەنگـی دابوویـەوەو لـــە رۆژی نەبــەردا لــە دەوری ئـــەو کۆبووبوونـــەوەو شەریاندەکرد کـوژرا، بـەهرام مـیرزا بـەگی کـوری محەمـەد بـەگی نظـام بـەگ، مەردانـە شەریکرد تا لە پــەلوپۆ کـەوت، تـا بـە یـاریدەی پـەروەردگارو بـەختی شـەهریار هـیزی هەورامییەکان بە خراپی تیکشکان و تا (حەوشی بـەدرانی) دوایـان کـەوتن و ئەویشـیان گرت، لەشکری هەورامی ژیان و مانەوەیان لەو ناوچەیە بـە مـەحاڵ زانـی و لـە ناچـاریدا بەرەو شارەزوور هـــەلاتن و هـەر سـێ فـەوجی تفـەنگچی سـەقز، مـەریوان، بانـە، نـاوی مەردو مەردایەتییان زیندوکردەوە، ظفر الملك لەم نەبەردەدا وەکو سەردارە ناودارەکـان مەردانە شەریکرد. لە هەموو شوینیك بە فەوجی (ظفر)ەوە پیشرەوی لەشکری خـاوەن ظفر بوو. چەند کەسیك بە زیندوویی گیران و بە فەرمانی بەهرام میرزا بەگ سەریانبرین، سەری شیخ کودو و چەندین سەری تر رەوانەی دارالایالە کـران و نـیردران بـۆ حـوزوری شازادەو مژدەی سـەرکەوتنیان بـۆ نـارد. شـازادە ئـەم هەوالـە دلخۆشـکەرەی گـەیاندە سەرانی دەولەتی پایەبەرزو داوای پاداشـتی بـۆ سـەرکردەکانی سـوپاو یەکـە بەیەکـەی ئەندامانی فەوجەکە کرد. لە لایەن دەولەتەوە مەدالیاو خەلات و زیـادکردنی مووچـە بـۆ هەریەکە لە سەرکردەکانی سوپاو پیشرەوە گیان لەسەر دەستەکانی بریاردراو ریگەیان درا بگەرینەوە ولاتی خۆیـان. شـازادە پـاش ئـەم سـەرکەوتنە بریـاریدا هەمیشـە چـوار دەستە سەرباز لە (حەوشی بەدرانی) بمیننەوەو ببنە بنکەی چاودیری، گەورەو بچوکـی تایەفەی هەورامیش چوونە ناو خاکی دەولەتی عوسمانییەوە. پاش ئەوەی سـالیك بـەم شیوەیە تیپەری هەورامییەکان هاتنە سەر ئـەوەی بگەرینـەوە کوردسـتان و پەنابەرنـە بەر دەرباری شازادە. یەکەمین کەس کە دەسـبەکار بـوو، (ئەحمـەد سـولتان) بـوو کـە هاتە مالی (قدوە الاسلام) مەلا ئەحمەدی شیخ الاسلام و لـە دەربـاری شـازادەدا ئـەوی کردە تکاکاری گوناهەکانی خۆی. شازادە بە هۆی پاکی سروشـتی خـۆیو تکـاو رجـای مـەولانا مـەلا ئەحمـــەدی شـیخ الاســلامەوە قەلــەمی بەخشــین و لیبوردنــی بەســەر

تاوانەکانیدا هیناو بەر لوتف و مەرحەمەتی کەوت. هەورامیەکانی تر کــە بــە بەخشــرانی ئەحمەد سولتانیان زانـی گوریـان دایـە بـەر خۆیـان و محەمـەد سـەعید سـولتانیش بـۆ پەنابردن خۆی ئامادەکرد، فەیروزە خانمی خیزانی کە ژنیکی جوان و سـەلارو سـەنگین بـوو، نـاردی بـۆ دەربـاری شـازادە بـۆ ئـەوەی داوای ئـەمانی بـــۆ بکــات و روخســـەتی گەرانـەوەی محەمـەد سـەعید سـولتان وەرگریـت. شــازادە ئــەمانی پیبەخشــیو بــە تکاورجای عەلی ئەکبەر خـانی شـرف الملـك ریگـەی دا بگەریتـەوە. پـاش چـەند رۆژیـك محەمەد سەعید سولتان هـات و پـەنای بـردە بـەر تەویلـەی ئەسـپەکانی شـازادە. لـەم کاتەدا یەکیك لە براکانی حەسەن سولتان کەتا ئەوکاتـە لـە زینـدانی شـازادەدا بـوو لـە بەندیخانەدا مرد، ناوی بارام بەگ بوو پیاویکی زۆر ستەمکارو ناپاك بوو. یەکیکی تریان کە ناوی مستەفا بەگ بوو بە پیچەوانەی بـارام بەگـەوە پیـاویکی بەسـەزمان و هیمـن و لەسـەرخۆ بـوو و لـە کـاتی شـەری هەورامییەکانیشـدا هیـچ خراپەیـەکی لینـــەبینرابو و نەبیسترابوو. میرزا رەزا عەلی دیوان بەگی، نیردراوی کەسوکاری مستەفا بەگی هینـا بـۆ شار لە حوزوری شازادەدا بـووە تکاکـاری رزگـاربوونی و لـە راسـتیدا بـوو بـە کـەفیلی. شازادە مستەفا بەگی بە میرزا رەزا عـەلی دیـوان بـەگی سـپاردو لـە لایـەن دەولەتـەوە (٧٠٠) تمەن مووچەی بۆ خۆیو کەسوکاری برییەوە تا لە شاری سنەدا بێ ئـەو پارەیـە بکەنە مەسـرەفی ژیـان و گوزەرانیـان و بـۆ هیـچ کـوێ نـەچن. پـاش ئـەوەی ماوەیـەك بەسـەر ئـەم رووداوانـەدا تیپـەری بـە پیـــی فـــەرمانی شـــازادە، عـــەلی ئەکبـــەر خـــانی (شـرف الملـك) بـەرەو جوانـرۆ کەوتـەرێ بـۆ ئـەوەی حکومـەتی ئـەوی بگریتەدەســت. شازادە ژیر بە ژیر رایسپارد محەمەد سەعید سولتان لەگەڵ خۆیـدا بـەریت بـۆ جوانـرۆو یەکجاری ئەو ناوچانە لە شەرو خراپەی خۆیو کەسوکاری رزگاربکات، شــرف الملـك بـە پیی فەرمودەی شازادە رەفتاری کـردو محەمـەد سـەعید سـولتانی لەگـەڵ خۆیـدا بـرد. نووسـەری ئـەم رووداوانـە دریـژەو وردەکارییـەکانی رۆیشـتنی شـرف الملـــك و گرتـــن و کوشـتنی محەمـەد سـەعید سـولتان و کـورو کەسـوکارەکانی لـە خـودی شــرف الملـك

بیستووەو بـەم شـیوەیە گیرایـەوە: کـاتیك کـە لـە سـنەوە بـەرەو جوانـرۆ کەوتینـەری محەمەد سەعید سولتان کە پیـاویکی زیـرەك و دانـا بـوو لـە نیـوان گومـان و دلنیـاییدا هەستی بە نیازی من کردبوو، هەمیشە بە جۆریك دەجوولایەوە کە بتوانێ بە تەواوی لە نیازو مەبەستی من حالی بیت، کاتیك کـە لـە مەنزلگەیەکـەوە دەکەوتینـە رێ جـاری وا هەبوو یەك فەرسەخ پیشدەکەوت جاری واش هەبوو دوادەکـەوت بـۆ ئـەوەی هـەولبدات بزانیت هیچ دلەراوکێو مەراقیك لای من دروست دەکات یانە؟ منیش بـە هـەموو جۆریـك چاوم لیدەپۆشیو خۆم دەخـافلاندو بـە هیـچ شـیوەیەك هـەوالی ئـەوم نەدەپرسـی، تـا دەگەیشتینە مەنزلیکی ترو خۆی بـە ئـارەزووی خـۆی دەهاتـەلام. لـەم خۆخلافـاندن و هـەوالْ نەپرسـینەی مـن بـە تـەواوی ئاسـوودەو دلنیـا بـوو و خـەیالْ و گومانـەکانی رەوینەوە. کە گەیشـتینە جوانـرۆ بەوپـەری میهرەبانییـەوە لەگـەلیدا جوولامـەوە. لـەو ماوەیەدا عبدالرحمن بەگی کوری لە هەورامان حاکم بوو. ویستم ئەویش بخەمە داوەوەو هـەموویان پیکـەوە لـەناوببرین. محەمـەد سـەعید سـولتانم بـە تـەنیا بینـیو پیـم وت: بنووسە بۆ عبدالرحمن بەگ با لەگەلْ پیاوەکـانی خۆیدا بیـت بـۆ جوانـرۆ. ئـەوان لـیرە نیشتەجێ بن و ئیوەش بچن بۆ هەورامان، ئەویش قبولی کردو یەکسەر پیـاویکی نـارد. لە ماوەی ٢–٣ رۆژدا کورەکەیو پیاوەکـانی هـاتن بـۆ جوانـرۆ، پـاش هاتنیـان، رۆژیـك بەرەبەیان سەیفور بەگم بانگکرد کە سەرۆکی خزمەتکارە تایبەتیـەکانی خـۆم بـوو، بـە نهینی نیازی خۆم بەرامبەر بە محەمەد سەعید سولتان پیراگەیاندو زۆر جـەختم لەسـەر ئەوە کردەوە کە نابێ کەس بە مەسەلەکە بزانێ وپاشان سەبارەت بـە گرتنیـان راویـژم لەگـەلدا کـرد، لـە ئـەنجامدا گەیشـتینە ئـەوەی کـە محەمـەد سـەعید سـولتان و کەسوکارەکەی بـانگ بکـەم بـۆ لای خـۆم و سـەیفور بـەگ مەسـەلەکە بـە کۆمـەلیك لـە خزمەتکارەکانی خـۆم رابگەیـەنیت، پاشـان لـەناو خـەلکدا وای نیشـان بدەیـن کـە ئـەو خزمەتکارانـە لەگـەلْ سـەیفور بـەگدا بەیـەکدا هەلشـاخاون، هـەم سـەیفور بـەگ و هـەم خزمـەتکارەکانیش بـۆ شـکات کـردن بینـە لای مـن، منیـش یەکسـەر بـە مەبەسـتی

تەمیکردنی نۆکـەرەکان مەجلیسـەکە بـەجیبیلم و لەگـەڵ هەسـتان و چوونـە دەرەوەی مندا محەمەد سەعید سولتان و کەسوکارەکەی بگرن و زنجیریـان بکـەن. سـەیفور بـەگ بەوپەری ریکوپیکیـیـەوە هـەموویانی گـرت و زنجـیری کـردن، پـاش ئـەوە یـەك بەیـەك هەموویانی لە بەردەم بینای حکومەتدا بە سزای خۆیانیان گەیاندو کردنی بـە نیشـانەو کوشتنی. پاش ئەمە شرف الملك باسی رووداوەکەی بۆ شـازادە نوسـی، شـازادەش لـە پاداشتی ئەو خزمەتەی شرف الملك دا پلەی سەرتیپی و خەڵات و مەدالیای لە دەولـەت وەرگرت. لە راستیدا ئەم محەمەد سەعید سولتانە پیـاویکی بیئـەندازە خـراپ بـوو، بـە پلان و تەقەلای شازادەو کۆششــی شـرف الملـك ئـەو بەڵایـە لـە کۆلـی خـەلك و جیـهان بووەوە. پاش نەمانی ئەو، هەردوو هەورامان ئاسوودە بوون. بەم جۆرە شازادە معتمد الدولە سێ حەقی بەسەر خەلکی کوردسـتانەوە بـۆ خـۆی تۆمـارکردو لـە راسـتیدا نـاوو ناوبانگی کوردستانی زیندوو کردەوە. یەکیك لە حەقـەکانی شـازادەلە کـۆل کردنـەوەی هەورامییەکان بوو، ئەم هەورامییە شــەرەنگیزانە تـا رادەیـەك باڵادەسـتی و دەسـەڵاتی تەواویان بە دەسـت هینـابوو، لـە لای خـاکی دەولـەتی عوسمانیـەوە تـا نزیکـی شـاری سلیمانی، جیبەجیکردنی هەموو حوکم و فەرمانیك بە دەستی بە هـیزی ئەوانـەوە بـوو، لە لای دەولەتی ئیرانیشەوە تا نزیکی شاری سنە بەجیگـەیاندنی هـەموو کاروبـاریك بـە دەستی دەسەڵاتدارانی ئەوان بوو. سنووردارانی هەردوو دەولـەتیش مەسـەلەیەکی ئـاوا گەورەیان دەشاردەوەو بە پیی پیویست بـە دەسـەڵاتدارانی دوو دەولەتـە گەورەکـەیان رانەدەگەیاند، تا بەو شیوەیەی باسکرا ئەم شازادە گەورەیە بە زۆر ریشەکیشی کـردن. یەکیکی تر لە حەقەکانی ئەم شازادە خانەدانە لە کۆلکردنـەوەی سـتەم و دەسـتدریژی خراپەکارەکانی ویلایەتە هاوسیکانی کوردسـتان بـوو، چونکـە نزیکـەی سـێ سـال بـوو خەلکی کوردسـتان کەوتبوونـە ژیـر زولـم و سـتەمی ویلایەتـە دراوسـیکانیەوە، تـا ئـەم شـازادە رەوشـت بـەرزە پیاوخراپـەکانی ئـەم ویلایەتانـەی لـەناوبردو زەلیلــی خــەلکی کوردسـتانی کـردن، بـە جۆریـك تەنـها لەسـەر خراپەیـەکی بچــووك یــەکیك لــە خانــە

دەسترۆیشتووەکانی (کولیایی) بەدیل گرت و لە کوردستاندا زنجیری کـرد. یـەکیکی تـر لە حەقەکانی ئەم شازادە مەزنە بەسەر خەلکی کوردسـتانەوە لـەناوبردنی خیلـی جـاف بوو. لە راستیدا لەناوبردنی ئەم خیلەو لە کۆلکردنەوەی شەریان لەسـەر کوردسـتان بـە کاریکی مەحالّ دەهاتەپیش چاو، ئەم شازادە پایەبەرزە بـە فـەرمانی شـەهریاری تـاج لەسەر، بە جۆریك دەستی دایە لـەناوبردنیان کـە نـاوو ناوبـانگیکی لـە کوردسـتاندا بـۆ نەهیشتنەوە. دریژەی ئەم باسەیش بەم جۆرەیە:

خیلی جاف یەکیکە لە خیلە گەورەکان، ژمارەی ئەندامانی لـە دوانـزە هـەزار کـەس پتر دەبیت. ئەم خیلە لە نیـوان دەولـەتی ئـیران و عوسمـانیدا کیشـەیان لەسـەرە. لـە بەیاننامەکانی نیوان ئەم دوو دەولەتەدا، ریکەوتبوون لەسەر ئـەوەی ئەگـەر ئـەم خیلـە بوونـە وابەسـتەو پابـەندی هـەرکام لـەو دوو دەولەتـە، ئـەویتریان مـافی قسـەکردن و رەخنەگرتنی نەبیت، بەهۆی ئەمەوە ئەم خیلە سـالەهای سـال بـە فیـلّ و تەلەکـەبازی ژیانیان دەبردە سەر. هەر وەکـو(حوشـتر مـرغ) ئەگـەر پییـان بگوترایـە ئیـوە بـالدارن دەبیّ بفرن، دەیانگوت حوشـترین، ئەگـەر پییـان بگوترایـە ئیـوە حوشـترن بارهـەلگرن دەیـانگوت ئیمـە بـالدارین. بـەم شـیوەیە لـە نیـوان هـەردوو دەولـەتدا بـە ئاسـوودەیی گـەرمیان و کویسـتانیان دەکـردو بـە ئاسـوودەیی دەیـانگوزەراند، لـە پـاییزو زسـتاندا دەچوونـە ناوچـە گەرمـەکانی عـیراقی عـەرەب و لـەویّ نیشـتەجیّ دەبـوون، لـە وەرزی بـەهارو هـاویندا دەهاتنـە کویسـتان و کیوەکـانی کوردسـتان و خیـوەت و رەشمالیـان هەلئەداو دەسوپیوەندەکانیان دەگەیشتنە سیّ فەرسەخی شاری سنە. بە ناوی حـەقی لەوەرگاوە سالآنە بریك پارەیان دەدا بە حاکم و خەزنەداری کوردستان، ئەم خیلـە دزو فیلبـازەی جـاف جگـە لـەو دزی و دەسـدریژییەی بـە نـهینی دەیـانکردە سـەر خـەلکی بیدەرەتانی کوردستان، ئەو گوندانەشیان بە تەواوی ویران دەکـرد کـە دەکەوتنـە سـەر ریگایان و دەیانکردە لەوەرگاو کیلگەی خۆیان و سـلیان لـە رشـتنی خوینـی هـەژاران و بردنی مالی بیدەرەتانان نەدەکردەوە. کەس لە بەرامبەر خیلی جافدا، خاوەنی گیـان و

مالی خۆی نەبوو خەلکی بیچارەی کوردستان لە ترسی رەفتارو کردەوەی وەحشـیانەی ئەم خیلە شەرەنگیزو خراپەکارە بیویژدانە، هەمیشە هەلدەهاتن و تووشی سـووکایەتی دەبـوون، شـەکوایان دەبـردە لای هەکەرسـیك قسـەکانیان بـە ئەفسـانەو حەکایـەت لـە قەلەم دەدان، تا دەسەلاتی حوکمرانی کوردستان کەوتە دەستی کـاراو بـە توانـای ئـەم شـازادە مسـکین پـەروەرە دادگـەرە. دیسـان خیلـی جـاف وەکــو پیشــەی ســەرەکی سەردەمەکانی پیشوویان بۆ کویستان هاتنە ناو خاکی کوردسـتان و چـەند کەسـیك لـە سەرکردەکانیان بە دەست و دیارییــەوە نـاردە حـزووری شـازادە.شـازادە ماوەیـەك بـە وردی چاودیری کردارو رفتارەکانی کردن و رەفتارەکانیان بەرامبەر خــەلکی کوردسـتان بە زولم و ستەمیکی گەورە هاتە بەرچاو و قبوولّ کردنی ئەم رەفتارانەی جافــەکانی بـە مایەی رق و غەزەبی خـواو رەنجـانی دلـی شاهەنشـای مـەزن زانـی، بـە سـەرکردەکانی جافی راگەیاند کە ئیوە تەنها دوو ریگـەتان لەبەردەمدایـە یـا دەبـیّ سـەر بـە دەولـەتی ئیران بن و وەکو رەعیەتەکانی تری ئەم دەولەتە لەناو خاکی کوردستاندا نیشتەجیّ بـن و ملکەچی فــەرمانی والی کوردسـتان بـن، یـاخود لەمـەودوا هـەرگیز نەیینـە ناوچـەکانی کوردسـتان. سـەرکردەکانی جـاف بەوپـەری نائومیدییـەوە گەرانــەوە، لــە ســەرەتای بەهاری داهاتوودا شازادە لەشکری ئامادەکردو ناردی بۆ دوو جیگــە کـە شـوینی هاتنـە ناوەوەی خیلی جاف بـوون بـۆ نـاو کوردسـتان. لـە لایەکـەوە بـۆ (شـلیرو نـاوخوان) و لەلایەکی تریشەوە بۆ مەریوان و خالی (خاومیراوا)، کاتیك کە وەختی هاتنە کویسـتانی خیلی جاف هات و بەرەو کوردستان هاتن، لەهەر سووچیکەوە بەرەو مەبەستی خۆیـان کەوتنەریّ، بواریان نـەبوو و بـە تـرس و نـائومیدی گەرانـەوە دواوە. کـە ئـەم حالـەیان دیمەزلوومانە سکالاو شکایەتیان بۆ شازادە نووسـیو ئامادەییـان پیشـاندا کـە سـالانە نزیکـەی دوو هـەزار تمـەن بـە نـاوی دیـاریو حـەقی لـەوەرگاوە پیشـکەش بکـەن بــەو شەرتەی ریگەیان بدریت بینــە کویسـتانی کوردسـتان. شـازادە چـاوی لـەم دەسـکەوتە پۆشی و زیاتر لە جاران سوور بوو لەسەر ئەوەی ریگەیان نەدات. خیلی جـاف کـە هیـچ

شتیکیان لەم پیشـنیارە دەسـنەکەوت کەوتنـە سەرکیشـیو شـەرو پـەلاماردان، بـەلکو بتوانن بە هیزو بــە زۆر بینـە نـاو خـاکی کوردسـتانەوە، سـوپای دەولـەت بـەرەنگاریان بوویەوەو تیکوپیکیان شکاندن. خیلـی جـاف بـە سەرشـۆرییەوە لـە جـەنگ گەرانـەوە. خەلکی کوردستان بە هۆی لوتف و بەزەیی ئەم شازادە پایە بەرزەوە ئاسوودە بـوون و لەو رۆژە بە دواوە بە پیی هەمان بەرنامەی شازادە لەشکری دەولەت دەچن بۆ ئەو دوو ناوچەیە بۆ ریگەگرتن لە خیلی جاف و هەتا رۆژی ئەمرۆمان کە سالی ۱۳۰۹ی کۆچییە، بیست و سێ سالی تەواوە ئەم نەریت و ریسایە کاری پیدەکرێ و جیبەجێ دەکریت لـە پیناو ئاسوودەیی خەلکی کوردستانداو سالانە بریکی زۆر پارە خەرج دەکرێ بۆ ئەوەی ریگە لە هاتنی ئەم خیلە خراپەکارە بۆ کوردستان بگیریت

شاعیر گوتوویەتی: **لەودیو پیاوە گەورەکان کە بیانەویت کاریك بکەن ئاوا دەیکەن شمشیری پاشایانیش بەم جۆرە ئاسەواری خۆیان دەردەخەن.**

شازادە فەرمانی دا ئەو کیلگەو لەوەرگایانەی شوینی کویستانی جاف بوون، چاکو ئـاوەدان بکرینـەوەو بـە پیـی رینماییـەکانی شـازادە چـەندین شـوین و گونـد ئاوەدانکرانەوە، یەکیکیان ناونا فەرهاد ئاباد بۆ ئەوەی نیشـانەو پاشماوەیـەك بیـت بـۆ رۆژگار. لەسەر خالی (خاومیراوا)ش کە مۆلگەو بنکەی سوپای دەولەت بـوو، قەلایـەکی تری ئاوەدان کردەوەو ناوی نا (لەشکر ئاوا). شازادە داوای لەم بەندە بچووکە کـرد کـە میژووی گرتنی هەورامان و میژووی دروستکردنی قەلای لەشکر ئاوا بنووسـم کـە بـەندە لـەو کاتـەدا سـەرکاری میرزاکـان بـووم، بـۆ هەریەکـەیان قەسـیدەیەکم دانـا لـە دوا بەیتەکـەیاندا سـالی گرتنـی هـەورامان و دروسـتکردنی قەلاکـە بـە ژمـارەی ئەبجـەدی تۆمارکراوە. بۆ گرتنی هەورامان کە ریکەوتی مانگی ربیع الثانی سالی ۱۲۸٦ بـوو، ئـەم شیعرەم نووسی:

**گفتم از شهر ربیع الثانی ار صد کم کنی**

**حفت بفزایی شود تأریخ فتحت آشکار**

واتە لە مـانگی (ربیـع الثـانی)– پـاش ئـەوەی بکرێ بـە ژمـارەی ئەبجـەدی، سـەد کەمکـەرەوەو حـەوتی بـۆ زیـاد بکـە میـژووی گرتنـی هـەورامانت لا رووندەبیتـەوە. بـۆ دروستکردنی قەڵاکەش لە کۆتایی قەسیدەکەدا ئەم شیعرەم عەرز کرد:

**قەلەم لە سالی دروستکردنی قەڵاکەدا نووسی**

**لە بەرەکەتی معتمد الدولە وە قەڵا ئاوەدان کرایەوە**

ئەم قەڵایە دوو ساڵ پاش ریگـەگرتن لـە جـاف ئـاوەدان کرایـەوە. لـە کۆتاییـەکانی سالی ١٢٨٧دا نەخۆشی تاعوون بڵاوبوویەوەو دوو سێ مانگ دریژەی کیشا. پاشـان لـە سەرەتای ١٢٨٨دا قاتوقری پەیدابوو، لە هەموو ویلایەتەکانی ئیراندا بـەڵای قـاتوقری و گرانی زیادیکرد، لە کوردسـتاندا کـەمیك نرخـی شـتومەك بەرزبوویـەوە، بـەڵام بـە هیـچ جۆریك نەبوە هۆی پشـیوی و شـت کۆکردنـەوە تـا وردە وردە هـەژارو بیدەرەتانـەکانی ویلایەتەکان هاتنە نزیك شاری سنەو بریك نرخی نـان بەرزبوویـەوە. زۆری پینـەچوو لـە هەموو لایەکەوە پتر لە چوار هەزار کەس هاتنە ناو خـاکی کوردسـتانەوە. ئەمـە تۆزیـك سامی خەلکی بەرزکردەوەو گەنم فرۆشەکان هەلەکەیان قۆزتـەوەو هـەوڵ و کۆششـیکی زۆریان دا بۆ بەرزبوونەوەی نرخی گەنم، لە کوردستاندا خەرواری گەنم بە دوو تمەن بـوو گەیاندیانـە دوانـزە تمـەن. ئەمـەش حـالی هـەژار و بیدەرەتـان و ئاوارەکـانی سـەخت و دژوارکرد. شازادە هەندیك لە ئـاوارە هـەژارەکانی بەسـەر خـەلکدا دابەشـکردو خۆیشـی بەخیوکردنی هــەندیکیانی گرتـە ئەسـتۆو حـەمامیکی بـۆ شـوینی نیشـتەجیبوونیان بـە کریگرت، بۆ ئەوەی شەوو رۆژ تییدابن و بـۆ هیـچ کوییـەك نـەچن. لەگـەڵ ئـەم هـەول و تەقەلایانەی شازادەشدا نرخـی گـەنم دانەبـەزی. ناچـار شـازادە وای بـە چـاك زانـی کـە نزیکەی دە هەزار تەغار گەنمیدا بە گەنم فرۆشەکان بـۆ ئـەوەی بیفرۆشـنەوەو بـۆ هـەر تەغاریکی یەك تمەن وەرگرن کە لەم کاتەدا نرخی تـەغاریك گەیشـتبووە شـەش تمـەن. بەم بریارەی شازادە، گەنم فرۆشەکان زیاتر لـە هـەژارەکان تووشـی پەشـۆکان بـوون و چەند هەولیاندا گۆرانیك لەم بریارەی شـازادەدا بکـەن سـەرینەگرت. شـازادە تەنـها بـۆ

پاراستن وژیانەوەی گیانی خەلکی کوردستان و ئاوارەی ناوچەکانی، کە لــە (٥٠) هــەزار کەس پتربوون، ئەوەندە پیی لەسەر ئەم بریارە داگـرت کـە لـە ماوەیـەکی کـەمدا گـەنم لەناو شاردا ئامادەکراو بە نرخی یـەك تمـەن بـۆ هـەر تـەغاریك هەفتانـە گـەنم دەدرا بـە نانەواخانـەکان، نرخـی نـان کـە هـەر (مـەن)[٥٩] یکـی بـە سـێ (شـاهی)[٦٠] دەفرۆشــراو دەستیش نەدەکـەوت، گەیشـتە دوو (عەباسـی)[٦١] و زۆرو زەبـەند بـوو. هەرچـەند لـەم نیوانەدا پتر لە سێ هەزار کەس لە ئاوارەو خەلکی تر لە قاتوقری و سەرماو نەخۆشــیدا گیانیان لەدەستداو ئەوەی دەمرد رزگاری دەبوو، بەلاّم پاش هاتنی ئەم گەنجـە هـەموو هەژارانی ویلایەت حەسانەوە، حەزرەتی شازادە پارەی کفن و دفنی ئـەو هەژارانـەی لـە کیسەی خۆی دەدا، بـە گویـرەی دۆسـییەکان کـە تیایـاندا تۆمـارکراوە، لـە مـاوەی دە رۆژدا هەزارو پینج سـەد کەسـی کفـن و دفـن کـرد. بـە هـەرحالّ ئـەو سـالە بـەم شـیوە تیپەری. لە بەهاری سالی (١٢٨٩)ی کۆچیدا نرخ بە جۆریك دابەزی کە کەس ناوی گەنم و نانی نەدەهینا. لە کۆتایی ئەو سالەدا حەزرەتی شـەهریاری تـاجدار ناسـرالدین شـای غازی (خوا پایەداریکا) نیازی سەفەری فەرەنگستانی هـەبوو، ئـەم شـازادە گەورەیـەی بانگهیشـتکرد بـۆ (دار الخلافـە) بـۆ ئـەوەی لـەو ماوەیـەدا کـە سـولتان لـەوێ نـابیت ئەرکەکانی ئەو بەجیبگەیەنیت. شـازادە جیگـەداری حکومـەتی کوردسـتانی سـپارد بـە کـورە جوامـیرو ئازاکـەی خـۆی، واتـە شـازادە عـەبدولعلی مـیرزاو (حـاجی ئیسـماعیل وەزیری عەلی ئابادی)ی کردە یاریدەدەرو وەزیری کە پیاویکی دانـاو پیگەیشـتوو بـوو و خۆیشـی روویکـردە (دارالخلافـە)ی تـاران. پـاش گەرانـــەوەی شـــەهریاری تـــاجدار لـــە سەفەرەکەیو هاتنەوەی بۆ بارەگای سەلتەنەت و لەسەر کارلابردنی (میرزا حسن خانی سەدری ئەعزەم) کە هــەموو خـەلکی ئـیران دریـژەی ئـەم رووداوە دەزانـن، شـەهریاری تاجدار (معتمـد الدولـە)ی گـەراندەوە بـۆ حکومـەتی کوردسـتان و پـاش هاتنـەوەی بـۆ کوردستان و مانەوەی بۆ شەش مانگ، لە مـانگی سـەفەری (١٢٩١)ی کۆچیـدا شـازادە لەسەرکار لابراو شازادە تەهماسب میرزای (مؤید الدولـة) لـە جیـی کـرا بـە فـەرمانرەوا،

بەندە کە نووسەری ئـەم چـەند لاپەرەیـەم لەسـەر شـیوەی (کۆکردنـەوەو لیدەرکردنـی ژمـارە) ئـەم دیـرە شـیعرەم سـەبارەت بـە رۆیشـتنی فـەرهاد مـیرزاو هـاتنی شـازادە تەهماسب میرزا نووسیوە

**از تخت جلال رفت فرهاد**

**طهماسب بجای او مکان یافت**

واتە: فەرهاد لەسەر تـەختی گـەورەیی لاچـوو، تەهماسـب لـە جیـی ئـەو دانیشـت. لیکدانەوەی شیعرەکەش بـەم جۆرەیـە: (تخـت جـلال) بـە گویـرەی ژمـارەی ئەبجـەدی دەکاتـە ١٤٦٤. ئەگـەر (فرهـاد)ی لیدەرکریـت کـە دەکاتـــە ٢٩٠، دەمینیتـــەوە ١١٧٤. پاشان لەبەر ئەوەی (طهماسب) دەکاتـە ١١٧. ئەگـەر بخریتـە شـوینی فرهـاد هـەمووی دەکاتە ١١٩١ و میژووەکەی راستە. بە هەرحالّ رۆژی چوار شەممە ٢٨ی مانگی سەفەر شازادە معتمد الدولە لە کوردستانەوە کەوتەرێ. لە سـەرەتای لابردنیـدا شـازادە مـیرزا حسین خانی سەدری ئەعزەم ئەم شیعرەی نووسیوە:

**هەرچەندە دوژمنی، بەلاّم لە دلمدا جیی تۆم کردووەتەوە**

**میوانی خانەخویَ کوژی بەلاّم لە مالی خۆمدا جیمکردوویتەوە.**

لـە شـاری سـنە لـە کۆنـەوە مـالژمیری هـەبوو، بـــەو مانایـــەی کـــە ژمارەیـــان بـــۆ خانووەکانی شـاری سـنە دادەنـاو لەهـەر مـالیك بـە پیـی هـەژاریو دەولەمـەندی بریـك پارەیان وەردەگرت، لە دوو هەزارەوە تا پانزە هەزار. شازادە لەسەر داوای حاجی مـەلا محەمەد کە یەکیك بوو لـە خواپەرسـت و پیـاو چاکـەکانی کوردسـتان، ئـەم باجـەی بـۆ هەمیشە کـەمکردەوە، جگـە لـەوە لـە کوردسـتاندا کیـش و سـەنگی فرۆشـیارەکان زۆر جیاوازییان هەبوو. شازادە معتمد الدولە لە پیناوی نەهیشتنی ئەم جیاوازییەدا نزیکـەی یەك هەزار مەن سەنگی تەرازووی دروستکرد کە هەر مـەنیك نـۆ سـەد مسـقالّ بـوو، لـە شارو گوندو ناوچەکانی کوردستاندا دابەشی کردن و ئیسـتا هـەر هـەمان ئـەو سـەنگانە بەکاردەهینرین. لە سالی ١٢٨١دا کە سالیك پاش قاتوقرییەکە بوو، ژمارەیـەکی زۆر لـە

گەورە پیاوانی کوردستان بە نەخۆشی گرانەتاو سکچوون کۆچــی دواییـان کـرد، لەوانـە مەولانا شیخ ئەحمەدی شیخ الاسلام و میرزا نـادری مسـتوفی باشـی و مـیرزا اسـد اللـە خانی وەکیل و ئاغا لوتف اللەی دیوان بـەگی و ئیسـماعیل خـانی والی زادەو کۆمـەلیکی زۆر لە ئەشراف و پیاوماقوولان و بووە مایەی خەم و خەفەتی خەلکی ویلایەت.

## باسی حکومەتی شازادە تەهماسب میرزای مؤید الدولە لە سنە

به پیی فەرمانی شەهریاری جیهان گویٚ بۆ راگرتـوو، حکومـەتی کوردسـتان لکیـنرا بە حکومەتی کرماشانەوەو بە شازادە تەهماسـب مـیرزای (مؤیـد الدولـە) سـپیردرا، کـە ئەوکاتە فەرمانرەوای کرماشان بوو. شازادە، محەمەد شریف میرزای نارد بۆ کوردستان بۆ ئەوەی ئەم هەواله بگەیەنیت و خۆیشی دوابەدوای ئەو بەرەو کوردسـتان کەوتـەرێ، لـە دوارۆژەکـانی مـانگی ربیـع الاول ی ١٢٩١دا گەیشـتە دار الایالـەی کوردسـتان. ئـــەم شازادەیە بیئەندازە مەزن و خاوەن رەوشت و خوویەکی بەرز بوو، خـاوەنی چاکـەو بـە خشـندەیی بـوو، هـەموو مەسـەلە بچـووك و گـەورەکانی ویلایـــەت و ســکالای خـــەلکی دەخستە بەر دەستی میرزا ئەرەستۆی وەزیری خۆی. محەمەد مەهدی میرزای کوری لە هەمەدانـەوە هینـا بـۆ ئـەوەی ببیتـە جیگـری حکومـەتی کوردسـتان. پـاش گەیشــتنی محەمـەد مـەهدی مـیرزاو دوای وەرگرتنـی بـیروڕای مـیرزا ئەرەســتو، ســەنەدی بــاج و خەراجی ویلایەت و کاروبارەکانی تری لە عەلی ئەکبـەر خـانی شـرف الملـك وەرگـرت و ئەرك و کارەکانی محەمەد مەهدی میرزای سپارد بەوو خۆیشی بەرەو مەریوان کەوتەرێ بۆ سەردانی قــەڵای شـاه ئابـاد. پـاش چـوون و گەرانـەوە لـە مـەریوان و چـەند رۆژیـك مانەوە لە سنە، گەرایەوە بۆ کرماشان. لە کاتی هاتنیەوە بۆ کوردستان تـا گەرانـەوەی بۆکرماشان نزیکــەی دوانـزە هـەزار تمـەنی بەخشـییەوە. محەمـەد مـەهدی مـیرزا پـاش رویشتنی باوکی بەریزی دەستیکردە حوکمرانی، محەمەد مەهدی مـیرزا تـا ئەوکاتـە لـە قوتابخانە خەریکی خویندنی زانستە رەسمیەکان بوو بووو تەمەنی خـۆی لـە خویندنـی

زانستی نەحوو سەرف و کتیبە ئاینییەکانی تردا بەسەربردبوو و شارەزای پیچ و پەناکانی فەرمانرەوایی‌و شیوازی بەریوەبردنی ویلایەت نەبوو و هیچی لە بارەی خزمەتی رەعیەتەوە نەدەزانی. ریکوپیکی ویلایەت تیکچوو، شیرازەی کاروباری سنوور لیکترازا، لەم کاتەدا خەلکی ویلایەت ریکەوتن لەسەر ئەوەی ئالای سەرپیچی هەلکەن و رەشەخەلکەکە وەك ئاژەلْ دوایان کەوتن و چەند مەسەلەیەکیان کردە بیانوو و دەستیان لە گیانی خۆیان شت و روویانکردە (دار الحکومە). تایەفەی (چهاردولی) کە خزمەتکارو پاسەوانی محەمەد مەهدی میرزا بوون کەوتنە پاراستنی‌و ریگەگرتن لە خەلك. پیکدادن گەورە بوو و تەشەنەی سەند. لەم هەرایەدا چەند کەسیك لەو تایەفەیە کوژران و هەشت کەس لە خەلکی کوردستان برینداربوون، تا پیاوماقوولان و گەورەپیاوان هاتن و بلاوەیان بە کۆمەلْ و خەلکەکە کرد. کاتیك کە ئەم هەوالە گەیشتە دار الخلافە و خرایە بەردەست کاربەدەستانی دەولەتی هەمیشە پایەدار، شازادە مؤید الدولە و محەمەد مەهدی میرزایان لە حکومەتی کوردستان و کرماشان لابردو شازادە ئیمام قولی میرزای عیماد الدولەیان کردە فەرمانرەوای حکومەتی کرماشان و کوردستان.

## باسی حکومەتی شازادە عیماد الدولە لە سنە

کاتیك عیماد الدولە لە تارانەوە کەوتەرێ، گەورەپیاوانی کوردستانی بانگکرد بۆ هەمەدان. علی اکبر خانی شرف الملك و میرزا محەمەد رەزای وەزیرو چەند کەسیکی تر لە خەلکی ویلایەت بەرەو هەمەدان کەوتنەرێ بۆ حوزوری شازادە. پاش گەیشتنی خەلکی کوردستان، شازادە (حشمت السلطنە)ی کوری ناودیر کرد بۆ حکومەتی کوردستان و سەندنی باج و خەراج و، ریکخستنی کاروباری ویلایەتەکەی لە شرف الملك و میرزا محەمەد رەزای وەزیر وەرگرت. ئیتر شازادە گەرایەوە بۆ کرماشان و گەورەپیاوانی کوردستانیش لە خزمەتی (حشمت السلطنە)دا گەرانەوە بۆ کوردستان.

لەم سالەدا شــازادە (مؤيـد الدولـە) لای کاربەدەسـتانی دەولـەت حـەڤدە هـەزار تمـەنی زیادەی خستبوە سەر باجە ئەسلییەکەی کوردسـتان. شاهەنشـای ئایینپـەروەر تەنـها لەبـەر دادپـەروەری و خـەلك پـەروەری دەهـەزار تمــەنی لــەو باجــە کــەمکردەوە بــە شیوەیەکی هەمیشەیی و باجەکەی کرد بە حەوت هەزار، فـەرمانی هومـایونی پـیرۆز بـۆ (حشمة السلطنة) دەرچوو کە باجی کوردستان بە یەکسانی و بـەبێ مەبەسـتی تایبـەتی راسـتبکاتەوە. (حشـمة السـلطنة) بـە پیـی فەرموودەکـە رەفتــاری کــردو بــری باجــە بنەرەتییەکەی و مەرحەمەتی کەمکردنەوەکـەی بـە هـەموو خـەلکی ویلایـەت راگـەیاند. پاش ٣-٤ مانگ (عماد الدولە) لە کرماشان تووشی نەخۆشـی بـوو. (حشـمة السـلطنة)، (شرف الملك)ی کردە جیگری خۆیو بە پەلە چوو بۆ کرماشـان، کـاتیك (عمـاد الدولـە) ئەم جیهانە کاتییەی بەجیهیشت و روویکردە جیهانی کۆتایی نەهاتوو، پیش ئەوەی بــە تەواوی کۆچ بکا، خەلات و بەرگی حکومەتی کرماشانی بۆ (حشمة السـلطنة) و خـەلاتی جیگەداری کوردستانی بۆ (شرف الملك) لە دەولەت وەرگرت و بۆی ناردن. لــەم سـالەدا ئافـەتی کوللـە لـە کوردسـتان پـەیدابوو، خـەلکی ویلایــەت تووشــی خــەم و پــەژارەو سەرلیشیواوی هـاتن. هـەر لـەو سـالەدا بـە ئیجـازەی کاربەدەسـتانی دەولـەت زانایـانی کوردستان بە مەبەستی گەیشتن بە حوزوری پـیرۆزی شـا، چـوون بـۆ دار الخلافـە. لـەو سەردەمەدا کاروباری کوردستان کەمیك تیکچوو بوو. لە مانگی سەفەری سـالی ١٢٩٣دا کاربەدەستانی دەولەت غولام رەزا خانی (شهاب الملك)ی کوری خوالیخۆشبوو حوسـین خانی (نظـام الدولـەی شاهسـون)یـان کـردە فـەرمانرەوای کوردسـتان و ناردیـان. رۆژی چوونی زانایانی کوردســتان بـۆ دار الخلافـەی تـاران، شـهاب الملـك لـە تارانـەوە بـەرەو کوردستان کەوتەرێ، پاش ئەوەی گەیشە دار الایالەی سنە، (شرف الملـك) سـەری لـەم کارە سورماو رووی کردە تاران و پەنای بردە بەر ئارامگـای (شـا عبدالعظیـم). زانایـانی کوردستان پاش گەیشتن بە حوزوری هومایونی بەر مەرحەمــەتی شـاهانە کـەوتن. مـەلا محەمەد مەهدی شیخ الاسلام کە ئەوکاتە (امین الاسلام) بوو، نازنـاوی گـەورەی (شـیخ

الاسلام)ی وەرگرت کە پایەی باوباپیرانی خۆی بوو. مەلا محەمەد ئـەمینی مامیشـی بـە وەرگرتنی نازناوی (امین الاسلام) سەرفراز بوو. شا جلوبەرگ و خـەڵاتی گرانبـەهای بـە هەردوکیان و زانایانی تری کوردستان بەخشیو رەوانەی کوردسـتانی کردنـەوە. خـودی ئەم بەندەیە کە نووسەرو دانەری ئەم کتیبەم لـەم سـەفەرەدا یـاوەرو هـاوریی زانایـانی کوردستان بووم.

## باسی حوکمرانی رەزا خانی شەهاب الملك کوری حوسین خانی نظام الدوله

غـولام رەزا خـانی (شـهاب الملـك) لـە رۆژی یەکـەمی (ربیـع الاول)ی سـالی ١٢٩٣دا گەیشتە شاری سنەو لە باخی خەسرەوئاباد دا کە نزیکی شاری سنـەیە دابـەزی. پـاش حەفتەیەك گواستیەوە بۆ (دار الایالە) کە بارەگای حکومەتە. میرزا قـەزوینی خەزنـەدار کە یەکیك بوو لە خزمەتکارەکانی، پلەی وەزارەتی پیبەخشراو کاروباری باج و خـەراجو ئالوگۆری ویلایەت درایە دەست ئەو. ناوبراو پیاویکی کارامەو لیزان بوو، لـە ماوەیـەکی کەمدا شارەزایی و ئاگـایی لـە کاروبـاری وڵاتـدا پـەیداکرد. (شـهاب الملـك) دیوانخانـەی ریکخسـت بـۆ ئـەوەی بـە ئاگـاداری خـۆی بەشـە جیاجیاکـانی کاروبـاری ویلایـەت بەریوەبچیت. وەك پیشتر گوتمان (شرف الملك) چوو بۆ دار الخلافـەو پـەنای بـردە بـەر ئارامگای شازادە عبد العظیم. (شهاب الملك) بەوپەری سـەربەخۆیی کەوتـە حوکمرانـیو جیبەجیکردن و رایـی کردنـی پیویسـتیەکانی کاروبـاری خـەلك. هـەموو کاربەدەسـتانی سنووری بـانگکرد بـۆ شـارو بـە شـیوەیەکی شایسـتەو گونجـاو بریـاری جیبـەجیکردنی کارەکـانی داو پاشـان هـەموویانی بـە خۆشـییەوە نـاردەوە بـۆ شـوینی کارەکانیـان. حەیدەر بەگی وەکیلی مەریوان کە کابرایەکی سەرکیش و لەگـەڵ دەولـەتدا ناپـاك بـوو، بە هاوکاری کردنی محەمەد تەقی خـانی کـوری ئیسـماعیل خـانی بـەنی ئـەردەڵان کـە لاویکی دلیرەو ئەوکاتە حاکمی مەریوان بوو، بە فەرمانی شهاب الملـك گـیراو نـیردرا بـۆ

دار الایاله. ئه‌م کاره ئـه‌وه‌نده‌ی تـر سـنووره‌کانی ریکخسـت و ریگاوبـان و شـه‌قامه‌کان ئاسایشیان تیکه‌وت. شهاب الملك به شیوه‌ی خیل و عه‌شیره‌ت ره‌فتاری له‌گه‌ڵ خه‌لکی کوردستاندا ده‌کردو بیئه‌ندازه به‌خشنده بـوو. لـه پیـش هـه‌موواندا سـه‌ییده‌کان له‌سـه‌ر سفره‌ی به‌خشنده‌یی ئه‌و کۆبوونه‌وه‌و ئه‌میش به هاتنیان خۆشحاڵ بوو، لـه راده‌بـه‌ده‌ر چاوی له هه‌ژارو خانه‌دانه‌کانی کوردسـتان بـوو، ریـزی لـه شـاعیران و زانایـان ده‌گـرت، هه‌رچه‌نده ته‌مه‌نی که‌م بوو ره‌وشتی جوان و چاکی زۆر بوو. ئه‌و زانایانـه‌ی کوردسـتان که له تاران گه‌رابوونـه‌وه لـه سـۆزو مه‌رحه‌مـه‌تی ئـه‌و ئاسـووده‌و سـه‌رفراز بـوون. لـه ناوه‌راستی سالدا کۆمه‌لیك سه‌وزه فرۆش و به‌قاڵ و کوتاڵ فرۆش و بیکـارو سـاخته‌چی و هیـچ و پوچـه‌کانی شـاری سـنه بـه فیتـی هـه‌ندێ کـه‌س یـاخیبوون و هـه‌موو چاکـه‌و نیعمه‌تیکی شهاب الملك یان فه‌رامۆش کردو له پـه‌نای ئیمـامزاده (پیرعومـه‌ر)دا مانیـان گرت. کاربه‌ده‌ستانی ده‌وله‌ت ئه‌م کارانه‌ی یاخیبووه‌کانیان به پیلانی شرف الملك زانـی و ئه‌م کاره ناشیرینه‌یان دایه پالی ئه‌و، له راستیدا شرف الملك ئاگای له‌مانه نه‌بوو و نه به ئاشکراو نه به نهینی به کـاری وا رازی نـه‌بوو، لـه‌م کاتـه‌دا کـه‌ژاوه‌ی هومـایونی لـه کویستانه‌کانی (لار) و (شهرستانك) بوو شرف الملك له تـاران نیشـته‌جێ بـوو، بـه په‌لـه ژماره‌یـه‌ك سـواره‌یان لـه ئـوردووه‌وه نـارد بـۆ ئـه‌وه‌ی شـرف الملـك بگـرن. یـه‌کیك لـــه ناسیاوه‌کانی شرف الملك که له‌ناو سوپادا بـوو پیشـوه‌خت ئاگـاداری کـرده‌وه. شـرف الملـك بـۆ جـاری دووهـه‌م پـه‌نای بـرده‌وه بـه‌ر ئارامگـای شـازاده عبـد العظیـم. شــهاب الملکیـش ئـه‌مانی دا بـه‌یاخی بووه‌کـان لـه ئارامگـای ئیمــامزاده هاتنــه ده‌ره‌روه، لــه سه‌ره‌تای زستاندا که کۆتاییه‌کانی ئه‌م سال بوو، حکومــه‌تی کرماشـان و کوردسـتانیان به (نواب سولطان مراد میرزای حسام السطنة) سپارد.

## باسی فه‌رمانره‌وایی شازاده سولتان موراد میرزای حسام السلطنة

لـه راسـتیدا دەولـەت حکومـەتی کوردسـتانی سـپاردبوو بـە خـودی شـهاب الملـك و چاودیری و سەرپەرشتی دابووە دەست (حسام السلطنه). کاتی ك شـازادە لـە تارانـەوە کەوتەرێ لەگەڵ خۆیدا شـرف الملـك و خەسـرەو خـانی والی کـوری خوالیخۆشـبوو رەزا قولیخـانی هینـا کـە پیـاویکی راسـتگۆو سەرراسـت و رەفتـار چاکـە، بـە گەیشـتنی بـۆ کرماشـان بـە پیـی فـــەرمانی کاربەدەسـتانی دەولــەت خــەڵات و بــەرگی حکومــەتی کوردستانی نارد بۆ شهاب الملك، ئـەمیش لـەکاتی گەیشـتنی بـەرگی حوکمرانیـدا ریـزی پیویستی نیشانداو لەبەر چەند هۆیەك لەم دلنەواییانەی شازادە دلنیا نەبوو. شازادەش لە ژیرەوە بۆ شکست و تیکدانی کارەکانی ئەو هەولی دەدا، تـا ئـەنجام گەیشـتەئەوەی کە شهاب الملك دەستی لە حکومەت کیشـایەوەو لـە لایـەن کاربەدەسـتانی دەولەتـەوە دەست کیشانەوەکەی پەسەند کرا. لـە دەیـەی دووهـەمی مـانگی (ربیـع الاول)ی سـالی ١٢٩٤دا روویکردە تاران. شهاب الملـك لـەم ماوەیـەی حکومەتـەیدا بەوپـەری پاکییـەوە رەفتاری دەکرد، چـادریکی گـەورەی بـۆ تەکیـەی (حسـینییە) لـە کوردسـتاندا بـە ٨٠٠ تمەن دامەزراند، ئەو چادرە تا ئیستاش ماوە. بینای دوو قەراوڵ خانەی دروسـتکرد بـۆ ئەوەی ببیتە شوینی مانەوەو حەوانەوەی پاسەوانەکان، نیـازی وابـوو چـەندین بنکـەی پاسەوانی تر لـە شـوینە پیویسـتەکانی شـاردا دروسـت بکـات، بـەڵام بـۆی رینەکـەوت. کاتیك شازادە (حسـام السـلطنة) بـە رۆیشـتنی (شـهاب الملـك)ی زانـی، لەسـەر قسـەی (شرف الملك) خەلکیکی زۆری بانگکرد بۆ کرماشان، لە هەمان کـاتدا کۆمـەلیکی تـر لـە لایەنگرانی شرف الملك وەك جەنابی (مەلا لطف اللەی شیخ الاسلام) و مەلا عەلی قـازی و چەن کەسـیکی تـر لـە کرماشـان بـوون. لـە راسـتیدا شـرف الملـك خـۆی بـە حـاکمی سەربەخۆی کوردستان دەزانیو لەبەر ئەوەش داوای هـاتنی کوردسـتانییەکانی کردبـوو کـە بـەلکو بـەهۆی ئـەم شـازادە گەورەیـەوە دوو بـەرەکیی نیـوان خـەلکی کوردســتان کۆتـایی پـی بـهینرێ. نووسـەر دەلیـت هـەموو خـەلکی کوردسـتان لـە شـیخ و موریـدو ئەشراف و پیاوماقوڵان بەوپەری یەکیەتییەوە بریـاری دژایـەتیکردنی شـرف الملـك یـان

داو روویانکرده کرماشان. خـۆم یـەکێك بـووم لەوانـەو لـە هـەموو جییـەك پیاوماقوڵ و زانایان متمانەیان بە قسەو رای مـن هـەبوو. مـیرزا محەمـەد رەزاو خەزنـەداری دیـوان و وەزیری کوردستان بـاوکی مـیرزا یوسـفی راوێژکـاری دیـوان لەگـەڵ عبدالغفـار خـان کـە باوەرپێکراوی براکەی بـوو، هەرسـێکیان پیـاوی چـاك و دڵ و دەروون پـاك بـوون لـەم سەفەرەدا ئامادە بوون. جەنابی شیخ محەمەد (فخـر العلمـاء) و مـەلا محەمـەد مـەهدی شیخ الاسلام کە هەردووکیان لە زانـا پایەبـەرزەکانی کوردسـتان بـوون لـەم سـەفەرەدا سەرۆکایەتیان بە دەستەوە بوو. ئەم شیخ محەمەد فخر العلمایە لە نووسـین و گوفتـارو رەوانبێژیدا، لە هەموو زانستە تازەو کۆنەکاندا، لە عـەرەبی و فارسـیدا تـاك و تاقانـەی سەردەم بوو. بەهـەرحاڵ کـاتێك ئـەم کۆمەڵـە گەیشـتنە نزیـك دار الایالـەی کرماشـان و شازادە بە هاتنیانی زانی، لە خزمەت و لوتف و مەرحەمەتدا دریخی نەکرد. لـەم کاتـەدا کە پێنج رۆژی مابوو بۆ جـەژنی چوونـە سـەر تـەختی سـولتانی، کـەژاوەی شـازادە لـە عیمادییە بوو کە شوێنی نیشتەجی بوونی بوو. کوردستانییەکان هەرکە گەیشتن چوونە حوزوری شازادە. پاش چوونە حوزور، شیخ محەمەدی فخـر العلمـاء بـە زمـانی رەوان و قسەی بێ گرێ، شازادەی سەرسام کرد. شازادە شەیدای قسەو رستەکانی بوو، پاشـان فخر العلماء یەك بە یەك هەموو یاوەرەکانی خۆی بە شازادە ناساند، هـەموو بـەر لوتـف و مەرحەمـەت کـەوتن و روخسـەتی گەرانـەوەیان وەرگـیرا. پـتر لـە پـەنجا خیـوەت لـە شوێنی مانەوەی کوردسـتانییەکان هـەلدرابوو و هەریەکـە لـە شـوێنی خۆیـدا بەوپـەری ئاسوودەییەوە حەسانەوە. روژی بیستی ربیع الثانی ١٢٩٤ کـە رۆژی جـەژنی نـەورۆزی سولتانی بوو، شازادە بەوپەری شکۆو مەزنییەوە لە شوێنی کۆبوونەوە لەگـەڵ خـەلکدا دانیشتبوو. هەموو کوردستانییەکانی بانگکردو لـەلای راسـت و چەپیـەوە دانیشـاندن. ئەم بەندە بچووکەیشی لەبەردەمی خیوەتەکەی خۆیدا بۆ خویندنەوەی قەسیدە لەگەڵ (ظهیر الملك) کە وتەبێژی خۆی بوو، دانیشاندم. لەم کۆبوونەوەیـەدا شـەش هـەزار لـە کوردستانیو کرماشانی و هەمەدانی، سەرتیپ و سەرهەنگ، خاوەن پلەوپایەو یەکـە بـە

یەکەی سەربازانی فەوجەکان ئامادە بوون. پاش تەواوبوونی سڵاوو خۆناساندن ئەم بەندە بچووکە بە ئیجازەی شازادە قەسیدەیەکی خویندەوە، رەوانیو بی گری وگۆلی قسەو گوفتاری ئەم بەندە بی ناوونیشانە بەلای شازادەوە جوان و پەسەندو باش کەوتەوەو بوو بە هۆی سەرنجراکیشانی گویگران و دەستیك شالی کشمیری پی مەرحەمەت کردم. ئەم بەخششەی شازادە بوو بە هۆی دوژمنایەتی کوردستانییە نەیارەکان. بە هەرحاڵ زاناو ئەشرافە کوردستانییەکان بە شیوەیەکی گشتی بەر مەرحەمەتی شازادە کەوتن. نواب (ابو الفتوح میرزای مؤید الدولە) بەرگی حکومەتی کوردستانی کردەبەری کورەکەی خۆیو میرزا رەزای سەر مونشی خۆی کردە وەزیرو کاربەدەستی ئەو. کوردستانییەکان لەگەڵ ئەبو الفتوح میرزادا بەرەو کوردستان گەرانەوە. پاش گەیشتن بۆ دار الایالەی سنە، لە لایەن شازادەوە فەرمان گەیشت کە شرف الملك بچیت بۆ جوانرۆ، هەرچەندە پیی لەسەر نەرۆیشتن داگرت قبوڵ نەکرا. ناچار بە پیی فەرمانی شازادە خۆی بۆ رۆیشتن بۆ جوانرۆ ئامادەکردو رۆیشت. پاش رۆیشتنی ئەو ئەبو الفتوح میرزای مؤید الدولە بە راویژ کردن لەگەڵ میرزا رەزای سەرمونشی کەوتە ریکوپیك کردنی کاروباری سنوورەکان. شازادە حسام السلطنە خەسرەو خانی والی کردە فەرمانرەوای سەقزو رەوانەی کرد. سنوورەکانی تر، ابو الفتوح میرزا کاربەدەستی بۆ دانان، بەهەرحاڵ میرزا رەزای سەرنووسەران کە وەزیرو کاربەدەستی ابو الفتوح بوو، ئەم بەندە بچووکەی هەلبژارد کە (علی اکبر وقائع نووس)م و هەموو کاروبارەکانی ویلایەتی دایە دەستی من. ماوەی دوو ساڵ کاروباری ویلایەت بەم شیوەیە بەریوە چوو و هەموو کارەکانی ویلایەت ریکوپیك بوون. میرزا یوسفی راویژکاری دیوان کە ئەوکاتە نازناوی خەزنەداری هەبوو، لەم گۆرانکارییە دلی رەنجاو هەوای کاربەدەستی کەوتە سەری، لەگەڵ کۆمەلیك لە خزمەکانی خۆیدا چوو بۆ کرماشان بۆ حوزوری شازادە. شازادە نازناوی وەزارەت و کاری وەزارەتی پیبەخشیو گەرایەوە. میرزا رەزای وەزیریان بانگکرد بۆ (دار الدولە)ی کرماشان. پاش چەند رۆژیك

لەسەر بانگهیشتی شاهانە ئەم بـەندە بـی ناوونیشـانە چـوو بـۆ (دار الخلافـە)ی تـاران. مـیرزا یوسـفی راویژکـاری دیـوان بەوپـەری سـەربەخۆییەوە کاربەدەسـتی و وەزارەتـی کوردستانی گرتەدەست. بەهەرحاڵ لەم کاتانەدا کە میرزا یوسفی راویژکـاری دیـوان لـە کوردسـتان کاربەدەسـت بـوو، شـرف الملـك لــە جوانــرۆ حوکمــی دەکــردو بەوپــەری دلتەنگییەوە رۆژگاری دەبردە سەر. پاش ماوەیەك شازادە بـانگی کـرد بـۆ کرماشـان و لەوێ هیشتیەوە، تا حکومەتی کرماشانیان لـە شـازادە سـەندەوە. ئەوکاتـە بـەندە کـە نووسـەری ئـەم لاپەرانـەم لـە (دار الخلافـە) نیشــتەجێ بــووم. شــرف الملــك بــەهۆی خۆشباوەری خۆیەوە بەرامبەر بە من، هەموو هەفتەیەك لەگەڵ تەتەری دەولەتدا نامەی دوورو دریژی بۆ بەندە دەنووسی. بـەندەیش بـە ئـەندازەی توانـا هـەولم دەدا خزمـەتی بکەم و لە هیچ شوینیك چاوم لـە بـەرژەوەندی و خـیری ئـەو نەدەپۆشـی، تـا شـەرەف الملـك بـە بانگهیشـتی کاربەدەسـتانی دەولـەت روویکـردە تـاران. کـە گەیشـتە شـــەش فەرسەخی شاری تاران بەندەی بانگکردە لای خۆی بـۆ وەرگرتنـی زانیـاری پیویسـت و ئەم شیعرەی بۆ بەندە نارد:

**ئارەزوومەندیم لە رادە چووەتەدەر ئەی دۆست**

**ئەگەر تۆ ئەتوانی سەبربکەی ئیمە توانامان نەماوە**

منیش بی دواکەوتن کەوتمەرێ، لە گوندی (رەبـات کـەریم) بـە خزمـەتی گەیشـتم. پاش گەیشتن و دانیشتن و راویژکردن، رامان هاتە سەر ئـەوەی کـە بـۆ خۆپاراسـتن لـە مەرام و نیازەکـانی شـازادە (حسـام السـلطنە) پەنابەرینـە بـەر بارەگـای سوپاسـالاری گەورە کە میرزا حوسین خانە. هەر بـەم نیـازە بـە پەلـە چووینـە تـاران و لـە بارەگـای سوپاسـالاری گـەورەدا پـــەنامان گــرت. سوپاســالار پــاش حزمــەت و مەرحەمــەت و دلنیاکردنەوەی شرف الملك، ناردی بۆ خزمەتی (مستوفی الممالك) و ســەدری ئـەعزەم. سـەدری ئـەعزەمیش دلنیـای کـردو نـاردی بـۆ لای شـازادە حسـام السـلطنە. شـازادە، (شرف الملك)ی لە بیناکەی خۆیدا جیکردەوە. پاش یەك حەفتـە، کـە رۆژانـە ئەوپـەری

میهرەبانیو لوتفی بەرانبەر شرف الملك نیشاندەدا، خەیالی گرتنی کەوتە سەرو ئەم مەسەلەیەی بە نهینی بەکاربەدەستانی دەولەت راگەیاند. لەم کاتانەدا کەژاوەی هومایونی لە گولستانەکانی مازندەران بوو. میرزا عەلی خانی بەردەستی ناردە هەواری هومایونی بۆ وەرگرتنی ئیجازەی گرتنی شرف الملك. شرف الملك بە تەواوی بیئاگا بوو لەم مەسەلەیە. میرزا عەلی خان پاش حەفتەیەك گەرایەوەو حوکمی گرتنی شرف الملکی لەگەڵ خۆیدا هینا. ئەم بەندەیە لەملاو ئەولاوە بەم مەسەلەیەی زانی و شەوان بە دوای کۆکردنەوەی زانیاریدا بە هەموو لایەکدا دەچوو، تا بە ریکەوتیکی خوایی لە تاریکی شەودا ریم کەوتە شوینیك کە هەر ئەو میرزا عەلی خانە لەگەڵ میرزا عەلی نەقی برای راویژکاری دیواندا دانیشتبوون سەبارەت بەم مەسەلەیە راویژیان دەکرد. میرزا عەلی نەقی هەولی دەدا کە هەر ئەو شەوە شرف الملك بگرن. میرزا علی خان شەوی بە باش نەزانیو جیبەجیکردنی ئەم نیازەی خستە بەیانی. بەندە کە بەم نیازەیانم زانی، بە پەلە بە (شرف الملك)م راگەیاندو ئەو شەوەمان بە هەزار نارەحەتی و دەردەسەری بە رۆژ گەیاندو ئایەتی (الیس الصبح بقریب)مان کردە ویردی زمانی خۆمان. پاش هەلاتنی خۆر، لەگەڵ (شرف الملك)دا سواری عەرەبانەیەکی دوو ئەسپی بووین و پەنامان بردە بەر شازادە عبد العظیم. پاش چوونە ناو ئەو شوینە پیرۆزە، بە نووسین و تەلگراف باسی مەسەلەکەم بۆ حوزوری هومایونی و خزمەتی کاربەدەستانی دەولەت عەرزکرد. لە لایەن خەلافەتی مەزن و پایەبەرزەوە حوکمیکی ئاشکرا بۆ میرزا یوسفی سەدری ئەعزەم دەرچوو کە بە هچ جۆریك دەست بۆ شرف الملك نەبەن. میرزا عەباس خانی (قوام الدوله) کە ئیستا وەزیری کاروباری دەرەوەیە، بە دەسخەتی موبارەکەوە هات بۆ شازادە عبد العظیم و (شرف الملك)ی بردەوە بۆ دار الخلافه. لەم ماوەیەدا کە بەندە لەگەڵ (شرف الملك)دا پەنامان بردبوە بەر ئارامگای شازادە عبدالعظیم، مەلا محەمەد مەهدی شیخ الاسلامی کوردستان کە ئەویش لە تاران بوو لەگەڵ هیزەکانی میرزا عەلی نەقی برای راویژکاری دیواندا چووبوون بۆ مالی بەندەو بیئەوەی کەسوکاری

بەندە ئاگادارین هەرچی نامەو نووسراوی (شرف الملك)ی تیدا بوو بوو هەموویان بردبوو و دابوویانە میرزا عەلی نەقی. میرزا (عەلی نقی)یش پیشکەشی شازادە حسام السلطنەی کردبوو. لە بەرامبەر ئەم دزییەدا پانزە تمەنی بۆ مەلا محەمەد باقر وەرگرتبوو. کاتیك کە شرف الملك لەگەڵ قوام الدولەدا چوونە خزمەتی سەدری ئەعزەم بەو نیازەی نیوان شازادەو شرف الملك چاك بیتەوە جاریکی تر قوام الدولەی لەگەڵ شرف الملك ناردە خزمەتی شازادە. پاش ئەوەی کە چوون شازادە ئەو نامانای دەرهینا کە مەلا باقر لە مالی من بردبوونی. کە نامەکانی دایە دەست شرف الملك، نەیتوانی حاشای لیبکات و بەوپەری جورئەتەوە بە شازادەی گوتبوو کە تۆ بە تەمای لەناوبردنی من بیت بیگومان لەمانەش زیاتر دەلیم و دەنووسم. ئەم پرسیارو وەڵامە بووە دوا گفتوگۆی نیوان شرف الملك و حسام السلطنە و ئیتر جاریکی تر رووی یەکتریان نەدی. شرف الملك تەسلیم کردنی ئەم کاغەزانەی بە کاری من دەزانیو هەرچەند نکولیم لیدەکرد سوودی نەبوو. سەرئەنجام هەر ئەم مەلایە بوو بە هۆی ئەوەی پەیوەندی نیوان بەندەو شرف الملك بپچریت. شرف الملك پیاویکی عاقڵ و کاملی لەبەردەستدا نەبوو کە باری سەرشانی سووك بكات. تەنها کەسی بریتی بوو لە من. لە ناوەوەو لە دەرەوە، بەندەیان لەو دوورکردەوەو ئەویشیان لە بەندە رەنجاند. بەهەر حال بەندە بە نیازەکانی (شرف الملك)ی زانی بەرامبەر بە خۆم، بەڵام دیسان بەوپەری راستگۆیی لە خزمەتی ئەودا کارم دەکرد. لەم بەینەدا، کاتیك کە کاربەدەستانی دەولەت شازادە (حشمة الدولە)یان بە لەشکریکی پر چەکەوە کردە بەرپرسی لەناوبردنی فیتنەو ئاژاوەی شیخ عوبەیدوللا، شازادە شرف الملکی لەبەر ئاگاداری و شارەزایی هەلبژارد بۆ ئەوەی لە گەلیدا بیت. لە لایەکەوە شرف الملك بیئەندازە نارازی بوو لە رۆیشتن، لە لایەکی تریشەوە کاربەدەستانی دەولەت لەبەر چەند هۆیەك رۆیشتنی شرف الملك یان بە راست نەدەزانیو بیئاگا بوون لە نیازی شرف الملك. شرف الملك یان بانگکردە حوزوری هومایونی بۆ ئەوەی رووبەروو و لە دەمی شاوە ئەم سەفەرەی لی قەدەغە بکریت. پاش

چوونه حوزور، پاشا پیی فەرموو ئەم شیخ عبید اللەیە ئیش و کاری چیە؟ شرف الملك کە چاوەریی دەرفەتیکی ئاوا بوو، عەرزی کرد کـە ئـەم کەسـە پیـاویکی دەرویشـەو بـە هـۆی بـەنگ کیشـانەوە ئـەم خەیالـەی کەوتووتـە سـەر. ئەگـەر لـە لایـەن سـەرچاوەی خەلافەتەوە مەرحەمەتیك لەگەڵ کەس و کاریدا بکریت بیئەوەی هیچ زیانیك بە دەولەت بگات لەگەڵ لەشکری کوردستاندا کۆمەڵ و لایەنگرانی بڵاوە پیدەکـات و بـە پشـتیوانی خواو نگینی شاهەنشاهی خودی خۆی دەگریت و بە سزای کارەکانی دەگەیەنیت.

شەهریاری خاوەن تاج لە قسەو پەیمانەکانی شرف الملك خۆشـحاڵ و شـاد دەبـێ و حکومـەتی کوردسـتان و سـەرتیپی فـەوجی (ظفـر)ی پیدەبەخشـێ، فـەرمان دەدا بـە سەدری ئەعزەم کە لە خزمەتیدا ئامـادە دەبـێ، کـە لـەمرۆوە تـا رۆژیکـی تـر فـەرمانی بەرگی حکومەتی بدەن بە شرف الملك و لە تاران بچیتە دەرەوە. نووسەر دەلیت: خۆم لای قاپییەوانەکە لە چاوەریی گەرانەوەی شرف الملکدا دانیشتبووم، کتوپر شرف الملك لـە خزمـەت سـەدری ئـەعزەمدا هاتنـە دەرەوەو پیشـەکی مـوژدەی ئـەم لوتفـە هومایونییەیان دامێ. کـە سـەدری ئـەعزەم چـووە مـالی خـۆی، سـەرەتا بـە تـەلگراف شازادە ابو الفتح میرزای مؤید الدولەی بـانگکرد بـۆ تـاران کـە فـەرمانرەوای کوردسـتان بوو، هەوالی حکومەتی (شرف الملك)ی دا بە خەلکی کوردسـتان، بیدواکـەوتن فـەرمانی دا بە میرزا حەسەنی مونشی باشی کە فەرمانی حکومەتی ویلایەتی کوردستان بە نـاوی شرف الملك وە دەربکات. لە هەمان کاتدا لە لایەن خەلافەتی مەزنەوە لە ریگەی یەکیك لە پیاوە تایبەتیەکانی بارەگاوە فەرمان دەرچوو کە شرف الملك بچیت بۆ تەلگرافخانەو خەلکی کوردستان ئاگادار بکاتەوە. شرف الملك بە پیی فەرمانەکە بیدواکەوتن چوو بـۆ تەلگرافخانەو بە خەت و دارشتنی ئـەم بەندەیـە نزیکـەی هەشـتا تـەلگرافی نووسـی بـۆ یەکـە یەکــەی خــەلکی کوردســتان. پــاش نووســینی ئــەم تەلگرافانــە بــە شــادیو خۆشحالییەوە گەراینەوە. ئەم رووداوە لە مانگی (ذی القعدە)ی سالی ١٢٩٧ی کۆچیـدا رویدا. کە ئەم هەوالە لە سنەدا بڵاودەبیتـەوە مـیرزا یوسـفی راویژکـاری دیـوان و مـام و

براكانی تووشـــی پەشـۆكان و خەفـەت بـوون و بـە دوای چـارەدا دەگـەران. سـەرەنجام شازادە (ابو الفتــح مـیرزای مؤیـد الدولـة) لەگـەڵ زانایـان و ئەشـرافی ویلایـەتدا دەچنـە تەلگرافخانـەی كوردسـتان و حكومـەتی شـرف الملـك رەتدەكەنـەوەو نـارەزایی خۆیـان دەردەبـرن لـە دانـانی و بـە تەلـەگراف پـەیمان دەدەن كـە هـەركاتیك شـیخ عبیــدالله و لایەنگرانی پییان خستە ناو خاكی كوردستان و شاری سنەوە، گیـان و مـاڵ و منـداڵ و نەوەیان حەڵاڵ بیت. لە دار الخلافەیش كەسوكارو پیاوەكـانی شـازادە حسـام السـلطنە كە خۆی لەم كاتەدا چوو بوو بـۆ زیـارەتی (مەكـە)، پەنادەبەنـە بـەر مـیرزا عبدالوهـاب خانی (آصف الدولە). امین الدولە دەچیتە خزمەتی همایونی و عەرزی دەكات كـە لـەم كاتەدا حكومەتی شـرف الملـك بـی زیـان نییـە، چونكـە لـە لایەكـەوە شـیخ عبیداللـەی سەرۆكی كوردان جەسارەتیكی ئاوای نواندووە، لە لایــەكی تـرەوە ئەگـەر شـرف الملـك بچیتەوە بۆ ئەو سنوورە كێ دەلێ لە رووی غیرەتی كوردایەتییەوە پشتیوانی لـە شـیخ عبیدالله ناكات. پاش ئەم قسانە حەزرەتی هومـایونی دەستخۆشـی لـە (آصـف الدولـە) دەكات و قسەكانی پەسەند دەكات. ئەم پـرس و جوابـە لـە كـاتیكدا روویـدا كـە شـرف الملـك لـە دەربـاری هومـایۆنیدا ئامـادە بـو، بـۆ ئـــەوەی بـــەرگی رەسمـــی حكومـــەتی كوردستان بپۆشێ. بەندەش بە روالــەت راویژكـاری شـرف الملـك بـووم. لـە دواكـەوتنی بەرگەكەو شـیوەی هاتنـە دەرەوەی اصـف الدولـەو گفتوگـۆی لەگـەڵ پیـاوانی شـازادە حسام السلطنەدا، بە مەسەلەكەم زانیو بە تەواوی بۆ (شرف الملـك)م روونكـردەوە. لـە كاتی گفتوگۆی نیوان ئیمەدا شاهەنشای دل بیدار بـە مەبەسـتی سـەردانی فەوجـەكانی سوپا تەشریفی بردە مەیدانی تۆپخانە. بـەندە لـە خزمـەت شـرف الملكدا لەسـەر ریـی هومایونی وەستابووین. حەزرەتی پیرۆزی كە نزیك شرف الملك كەوتــەوە، هیـچ لایـەكی لینـەكردەوە، گومانەكـەی بـەندە بـوو بـە راست. شـرف الملـك گەرایـەوە بـۆ بارەگـای سەدری ئەعزەم. لە ماوەی یەك سەعاتدا قوام الدولە هاتە حـوزوری سـەدری ئـەعزەم و لابرانی (شرف الملك)ی بە فەرمانی هومایونی راگەیاند. شـرف الملـك و یاوەرەكـانی بـە

دلتەنگیو خەمباری گەرانەوە بۆ مالەوە. پاش تیپەرینی نزیکەی بیست رۆژ بەسەر ئـەم رووداوەدا لەسەر داوای مؤید الدوله فەرمانی هومایونی دەرچوو لەسەر ئەوەی کە شرف الملك و یاوەرەکـانی بچـن بـۆ خوراسـان و لـەوێ نیشـتەجێ بـن. پـاش هـەموو پـرس و راویژیـك پـەنامان بـردە بـەر قاوەخانـەی (خـاتوو ئـەنیس الدولـــە)ی خـــیزانی بـــەریزی شاهەنشای تاج لەسەر. مـاوەی بیسـت و حـەوت رۆژ بەوپـەری ریـزو نەوازشـەوە لـەوێ مانەوە، ئەنیس الدوله فەرمانی پـیرۆزی دەرکـرد کـە شـرف الملـك یـاوەری پاشـابیت و کەس دەستی بۆ نەبات، دووبـارە بـە دلنیاییـەوە گەرایـەوە بۆمـاڵ. پـاش چـوار مـانگ محەمـەد رەحیـم خـانی عـلاء الدولـە لـە مـانگی رەبیعـی دووهـەمی ١٢٩٨ دا لـە لایـەن دەولەتەوە حکومەتی ئازربایجان و نازناوی (امیر نظام)ی پیبەخشرا. ناوبراو ژمارەیەك لە پیاوانی دەولەتی دیاریکردو هەلیبژاردن بۆ ئەوەی لەگەلیدا بن. یەکیك لەوانـە شـرف الملك بوو، دیسان شرف الملك بە هـۆی ئـەو خـەوو خەیالاتـەوە کـە لـە سـەریدا بـوون، حەزی نەدەکرد بروات. بەندە بە لیکدانەوەو لەسەر رۆیشتن و بەلگەی بەهیز وام لیکـرد بکەویتە سەر خەیالی رۆیشتن و لە خزمەتی ئەمیر نیظامدا بەرەو ئازربایجان کەوتـەرێ. لە کاتی ئەم سـەفەرەدا شـرف الملـك هـەموو ئـەم زەحمـەت و دەردی سـەریانەی منـی فەرامۆش کردو خستنیە ژیر پیوە، بەو حسابەی کە بەندە لەگـەڵ مـیرزا یوسـفی راویـژ کاری دیواندا هاونیازم و هەر لە تاران بەجیی هیشتم.

**شیعر- بە تەمای وەفاو پاداشتی کەس مەبەو**

**بە خۆرایی بە دوای تەیری عەنقاو کیمیادا مەگەرێ**

پاش ئەوەی شرف الملك چوو بۆ ئازربایجان کردیان بە حاکمی ئەردەبیل و بە پیـی فەرمان و ئیرادەی هومایونی، کوردستان لە شازادە مؤید الدوله سەندرایەوەو خرایە ژیر ئیدارەی شازادەی مەزن (نواب اقدس محمود میرزا ظل السـلطان)ەوە. حـەزرەتی (ظـل السلطان) حکومەتی کوردستان و کرماشانیدایە دەست مـەحمود خـانی (نـاصر الملـك) کـە یـەکیك بـوو لـە سـەرۆکەکانی خیلـی (قـەرەگوزلو)ی هەمـەدان و لـە خزمـەتکارە

تاقیکراوەکانی دەولەتی هەمیشە بەر قەرارو پایەدار. (ناصر الملك) لــە تارانــەوە بــەرەو کوردسـتان کەوتــەرێو چــووە (دار الایالــە)ی کوردسـتان و خــەلکی ویلایــەت بـــە پیـــی پیویست پیشوازییان لیکرد.

## باسی حکومەتی مەحمود خانی ناصر الملك و سپاردنی حکومەت بە میرزا یوسفی راویژکاری دیوان

کـاتیك (نـاصر الملـك) مـاندوویی حەسـایەوەو سـەبارەت بـە بـارودۆحی ئەشـراف و گەورەپیاوانی ویلایەت زانیاری بەدەستهینا باجی ویلایەتی لە مـیرزا یوسـفی راویژکـاری دیوان وەرگرت و کردی بە وەزیرو جیگری حکومـەت، خۆیشـی بـێ ئـەوە بریـار لەسـەر هیچ کاریك بدا یـاخود دەسـتبخاتە هیـچ مەسـەلەیەکەوە، بـەرەو کرماشـان کەوتـە رێ. مـیرزا یوسـفی راویژکـاری دیـوان دەسـتیکرد بـە کۆکردنـــەوەی بـاج و جیبـــەجیکردنی کاروباری حکومەت لە ویلایەتدا. نووسەری ئەم کتیبـە دەلیـت: هەرچـەندە ئـەم پیـاوە گەورەیە ئەمسالّ لەگەلّ بەندەدا بە لوتف و میهرەبان نەبوو و بەندەش بە هیـچ جۆریـك دلسۆزیو وەفاداریم لە خزمەتیدا نەنواند، بەلاّم لە رووی حەق و راستییەوە دەلیـم لـەم سالەدا کە شیرازەی حکومەت و باج و خەراج درایە دەستی کارای ئەو، بە تـەواویو بـە ریکوپیکی خزمەتە ولایەتیو سنوورییەکانی جیبـــەجیکردو بەوپـەری پاکییـەوە لەگـەلّ خەلکدا دەجوولاّیەوە. خەلکی کوردسـتان لـە رووی کینـەو بەغیلییـەوە لـەو بارودۆخـە خەمبارو دلتەنگ بوون. پاش هەشت مانگ واتە لە مـانگی (ربیـع الاول)ی سـالی ۱۳۰۰دا زۆربـەی خـەلکی کوردسـتان بـە زانـاو پیاومـاقوولاّن و بازرگانانـەوە، بـە سـەرۆکایەتی جەنابی (شیخ محەمەد جەسـیم)ی (صـدر العلمـا) و جـەنابی (مـەلا لوتـف اللـەی شـیخ الاسـلام) کۆبوونـەوەو پـەنایان بــردە بــەر تەلگرافخانــە. بــری حــەفتا هـــەزار تمــەن زیادەروییان دایە پالّ میرزا یوسفی راویژکاری دیوان و بـە شـیوەی جۆراوجـۆر لـە ریـی تەلگرافەوە شکاتیان لیکرد. ماوەی هەشت رۆژ هەموویان لــە تەلگرافخانـە مانـەوە. لـە

هەردوولاوە حکایەتی جۆراوجۆرو چەندین شــکایەت عــەرزی حــەزرەتی (ظـل السـلطان) کرا. سەرەنجام حەزرەتی ظـل السـلطان، مصطفـی قـولی خـانی فەراشباشـی خـۆی بـە مەبەستی لیکۆلینەوەو چارەسەری ئەو فیتنەو ئاشووبە نارد. پاش هاتنی مستەفا قولی خان، ئاگری یاخی بووان بریك خامۆش بوو، بەلاّم ئاگری دوژمنایەتی ئەو دوو دەستەیە نەکوژایەوە، بەلکە بە تەواوی بلاّوبویەوە. حەزرەتی ظل السلطان مەلا لطف اللهی شـیخ الاسـلام و مـیرزا یوسـفی راویژکـاری دیوانـی بـانگکرد بـۆ ئەسـفەهان کــە هەریەکــەیان سەرۆکی یەکیك بوون لەو دوو دەستەیە. پاش بانگکردنی ئەوان (میرزا احمدخان اقبـال الملك)ی کردە حاکمی کوردستان و بە پەلە رەوانەی کوردستانی کرد. (اقبال الملك) لــە تارانەوە کەوتەریّو هاتە هەمەدان. کۆمەلیك لە هەردوو دەستەکەی خــەلکی کوردسـتان چوونە پیشوازی کردنی، بەلکو ریگە لە رۆیشتنی مەلا لطف اللهی شیخ الاسلام و مـیرزا یوسفی راویژکاری دیوان بگرن. (اقبال الملك) بۆ ئەم مەسەلەیە تکای لە حــەزرەتی ظـل السـلطان کـردو تکاکـەی قـەبولّ کـرا. پـاش گەیشـتنی ئـەم هەوالـە ئـەو زاتانـە لـە دوو فەرسەخی شارەوە گەرانەوە.

## باسی دانرانی میرزا محمود خانی اقبال الملك کوری میرزا بـابـای حەکیم بە جیگر لەلای شازادە ظل السلطان ەوە

(اقبال الملك) لە مانگی رەجەبی سالی ۱۳۰۰ی کۆچیدا گەیشـتە دار الایالـەی سـنە. لەم کاتەدا عەلی ئەکبەر خانی (شرف الملـك) لـە ئازربایجـان و حکومـەتی ئەردەبیلـەوە گـەرابووەوە بـۆ تـاران و لـەویّ نیشـتەجیّ بـوو. (اقبـال الملـك) پـاش ئـەوەی گەیشـتە کوردستان تکای لە حەزرەتی ظل السلطان کرد کە شرف الملك بنیریت بــۆ کوردسـتان. حەزرەتی ظل السلطان، شرف الملك ی رەوانە کرد. بەهەرحالّ لەم یاخیبوونەی خەلکی ویلایەتی کوردستاندا میرزا یوسفی راویژکاری دیوان نزیکەی پـانزە هـەزار تمـەن و مـەلا لطف اللهی شیخ الاسلام نزیکەی حەوت هەزار تمەن زەرەریان کرد. پاش ئــەوەی اقبـال

الملك هیلاکی ریی دەرکرد، دەستیدایە کاروباری ویلایەت و باجی ویلایەتی بە هەموو جۆرەکانیەوە لە سلیمان خانی کوری شرف الملك وەرگرت. بە کەفالەتی مەلا لطف اللەی شیخ الاسلام، سلیمان خانی بە نوینەرایەتی شرف الملك کرد بە وەزیرو یەکەم کاربەدەستی ولایەت. لە سالی یەکەمی هاتنی اقبال الملکدا شرف الملك و سلیمان خانی کوری یەکەم کاربەدەستی کوردستان بوون. لە سالی دووهەمی حکومەتی اقبال الملك دا کە ریکەوتی ١٣٠١ی کۆچی بوو، اقبال الملك، میرزا یوسفی راویژکاری دیوانی کردە وەزیرو یەکەم کاربەدەستی کوردستان و سەنەدی باج و خەراجی لەو وەرگرت. لەم سالەدا یەکیك لە ژنانی خیلی گەلباخی لە دەشت تووشی کابرایەك دەبیت لە خیلی تیلەکۆ، کە هەردوو خیلەکە لە خیلە گەورەکانی کوردستانن. کابرای تیلەکۆیی بەهۆی بەدرەوشتی خۆیەوە دەستدریژی دەکاتە سەر ژنە گەلباخییەکە. پاش ئەوەی هەردووکیان لیکجیادەکەنەوە، ژنە کە دەچیتە لای کویخا حەسەنی سەرۆکی تیرەی گەلباخی کە باوکی خۆی دەبێ، بە دریژی و بی زیادو کەم رووداوەکەی بۆ دەگیریتەوە. کویخایش لە پیاوەکانی خۆیو تایفەکەی و خزم و خویش و بیگانە نزیکەی دوو هەزار کەس سوارەو پیادە کۆدەکاتەوەو بیئەوەی جگە لە خۆیان هیچ لایەکی تر ئاگادار بکا بەوپەری هیزو تواناوە هیرش دەکاتە سەر تیلەکۆییەکان کە ئاگایان لە هیچ شتیك نەبوو. تیلەکۆییەکان کاتیك لە خەوی غەفلەت بە ئاگادین، دەبینن دوو هەزار کەس دەستیان داوەتە کوشتن و تالانکردن و خەریکی ئەتك کردن و دیلکردنی کەس و کارو مالّ و منداليانن و دەرفەتی شەرکردن و رووبەرووبوونەوەيان نەماوە. سووکە شەریك دەکەن و هەلدین. لەم تیکرژانەدا کویخا عوسمانی سەرۆکی تایەفەی تیلەکۆ لەگەلّ کوریکی و پانزەکەسی تایەفەکەدا دەکوژرین و چەند کەسیکی تر بریندار دەبن. گەلباخییەکان پاش ئەم پەلامارە لە ناکاوە، چەندیان لە توانادا بێ کەلوپەل و شتی بەجیماوو ئاژەلّ و مەروومالاتی تیلەکۆییەکان تالان دەکەن و دەگەرینەوە. تایفەی تیلەکۆ لەبەرئەوەی دایکی سیف الدین خانی کوری خوالیخۆشبوو

عەزیز خانی سەردار برازای کویخا عوسمانی کوژراوە، دین بۆ (سابڵاخ)ی موکریان و پەنا دەبەنە بەر (سیف الدین) خانی حاکمی سابڵاخ. سیف الدین خان دریـژەی رووداوەکە وەك خۆی عەرزی کاربەدەستانی دەولەتی خاوەن توانا دەکات. لە لایەن دەولەتەوە فەرمانی تۆلەسەندنەوەی خیلی تیلەکۆ لە گەلباخییەکان دەخریتە ئەستۆی (اقبال الملك) و فەرمانیش درا بە (سەیف الدین) خان کە کەسیکی جیی متمانەی خۆی بنیریت بۆ کوردستان، تاوەکو حاکمی کوردستان بە پیی یاساو ریسای ویلایەت بریاریك لەمبارەیەوە بدات و خوینی کوژراوەکانی تایەفەی تیلەکۆ بە فیرۆ نەروات. لەوکاتەدا بە پیی تەلەگرافی مۆرکراوی حەزرەتی موبارەکی (جینشین) و سەدری ئەعزەم، بەندە لای سەیف الدین خانی کوری خوالیخۆشبوو عزیزخان سەردەستەی نووسەران بووم و ئەرکی جیبەجیکردنی ئەم فەرمانەم خرایە ئەستۆ. لە مانگی ذی القعدەی سالی ١٣٠١دا بە چەند حوکم و فەرمانیکەوە هاتم بۆ کوردستانی سنەو پاش هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر، بە قسەو راویژی اقبال الملك و میرزا یوسفی مشیر الدیوان، بە شیوەی عەشایری سولح کراو خوینی کوژراوو بریندارەکان بە وردی حسابکراو بری هەزارو شەش سەدتمەن لەگەڵ دوو کچی کویخاکانی گەلباخیدا درا بە تیلەکۆییەکان و دواتریش پتر لە چوار هەزار تمەنی تر لە بری زەرەرو زیان خرایە ئەستۆی گەلباخییەکان. بەندە پاش کۆتایی هاتنی ئەم کارە گەرامەوە بۆ موکریان.

لە سەرەتای مانگی رەجەبی سالی ١٣٠٢ی کۆچیدا، حەزرەتی (ظل السلطان)، (اقبال الملك) و میرزا یوسفی مشیر دیوانی بانگکرد بۆ ئەسفەهان. پاش رۆیشتن و گەیشتنی اقبال الملك لابراو شازادە (احتشام السلطنة) کرا بە حاکمی کوردستان و لەگەڵ میرزا یوسفی مشیر دیواندا گەرانەوە بۆ ویلایەتی کوردستان. لە مانگی شەعبانی سالی ١٣٠٢دا گەیشتە سنە.

## باسی جیگریی ئیبراهیم میرزای احتشام السلطنه

## لە حکومەتی ظل السلطان دا

شازادە احتشام السلطنە لە بەریوەبردنی کاروباری حکومەتدا زۆر ناکاراو نەشارەزا بوو. بە هۆی نەشارەزایی ئەوەوە شیرازەی کاروباری ویلایەت تیکچوو. خیلی شەرەنگیزی جاف کە بێ کارەیی ئەویان بۆ دەرکەوت، هیرشیان کردە سەر کوردستانو بەهیچ جۆریك دەستیان لە رشتنی خوین و تالانکردنی مولك و مالی هەژاران نەدەپاراست. بایی پتر لە سەد هەزار تمەن مالی خەلکی کوردستانیان تالان کردو بردیان. تیلەکۆییەکانیش کە بۆیان دەرکەوت بارودۆخەکە شیواوەو سەرو سامانی خەلکی نەپاریزراوە، بە نیازی تۆلەکردنەوە لە گەلباخییەکان یاخیبوونی خۆیان دەستپیکردو بە ژمارەیەکی زۆرەوە لە ناکاو پەلاماری گەلباخییەکانیان داو (جواد) ناویکیان کوشت کە کوری کویخا حەسەنی سەرۆکی گەلباخی بوو. هەروەها چەند کەسیکیان کوشت و چەندیکی تریان برینداز کردو هەرچی کەلوپەلو مالیکیان بەردەستکەوت بە تالان بردیان و گەرانەوە. کاتیك ئەم هەوالە گەیشتە حەزرەتی ظل السلطان، فەرمانی قەلاچۆکردن و لەناوبردنی تایەفەی تیلەکۆی دەرکرد. احتشام السلطنە دوای راویژکردن لەگەڵ راویژکاری دیواندا، نامەی نووسی بۆ میرزا عبدالغفار خانی معتمد کە حکومەتی ناوچەی مەریوان و هەورامانی بەدەست بوو، تا خەلکی مەریوان و هەورامان و بانەو سەقز لەگەڵ خۆیدا بەریت تایەفەی تیلەکۆ تەفروتونا بکات. هەروەها فەرمانی دەرکرد بۆ حاکمی بانەو سەقز کە دەبێ گویرایەلی فەرمانی میرزا عبدالغفار خانی معتمد بن و بە گویرەی فەرمانی ئەو رەفتاربکەن. میرزا عبدالغفار خانی معتمد، پاش ئەوەی ئاگادارکرایەوە، نزیکەی هەزار تفەنگچی مەریوانی هەلدەبژیرێو پیشوەخت ئەم فەرمانە بە حاکمی بانەو سەقز رادەگەیەنێو بریاردەدات کە هەردوولا شەوی چوار شەمە لە کەناری رووباری خورخورە، کە دەکەویتە یەك فرسەخی ناوچەی تیلەکۆییەکانەوە، ئامادەبن. حاکمی بانەو سەقز لەکات و شوینی دیاریکراودا پەیوەندی دەکەن بە عبدالغفار خانەوەو پیکەوە لە ناکاو پەلاماری

تیلەکۆییەکان دەدەن و بەهەر شیوەیەك بۆیان گونجا دەستیان نەپاراست لە کوشـتن و تالآنکردن. کۆمەلیك لە تیلەکۆییەکان بە سەلامەت دەرچوون و پەنایان بردە بەر سـیف الدین خانی ئەمیر پـەنج لـە سـابلاخ. لـە لایـەن دەولەتـەوە بریـار دەرچـوو کـە لـە ژیـر چاودیریدا بیان نیرنە کوردستان. سـیف الدیـن خـان بـە پیـی فـەرمانی کاربەدەسـتانی دەولـەت تیلەکۆییـەکانی لەگـەلّ محەمـەد بـەگی پیـاوی خۆیـدا نـارد بـۆ کوردسـتان. بەهەرحالّ کاتیك ظل السلطان ناکارایی احتشـام السـلطنەی لـە حکومـەتی کوردسـتاندا بینی، لـە مـانگی (جمـادی الثـانی) سـالی ١٣٠٢دا لەسـەر کـار لایـبردو دووبـارە (اقبـال الملك)ی کردەوە بە حاکمی کوردستان. اقبـال الملـك بـەرەو کوردسـتان کەوتـەرێو لـە سەرەتای رەجەبی هەمان سالدا گەیشتە دار الایالەی کوردستان.

## باسی دانانی اقبال الملك بە جیگر لە لایەن شازادە ( ظل السلطان )ەوە بۆ دووەمین جار

پاش گەیشتنی اقبال الملك بە سنە بە هەمان شیوەی حکومـەتی پیشـوو کاروبـاری دارایی و باجی کوردستانی لە عەلی اکبر خانی شرف الملك وەرگرت و کـردی بـە وەزیـرو یەکەم کاربەدەستی ویلایەت و حەبیب بەگ ناویکی کردە حاکمی جوانـرۆ کـە سـەرۆکی تایفەی باباجانی خیلێ جوانرۆیە. مەجید خانی حاکمی سەقزو یونس خانی بـانگکرد بـۆ شارو یونس خـانی گـرت و مـەجید خـانی بەوپـەری متمانـەوە گیرایـەوە بـۆ حکومـەتی سەقز. بریك پارەی وەکو سزا لیسەند. پاشان یونـس خـان چـەند کەسـیك لـە بازرگانـە متمانەپیکراوەکانی کوردستانی کردە کەفیلی خۆیو گەرایەوە بـۆ ریکخسـتنی سـنوور. لەم سالەدا بە مەبەستی ریگەگرتن لە جاف لە لایەن حەزرەتی (ظل السلطان)ەوە یـەك فەوج سەربازو ٣٠٠ لە سوارەی (فتحیە)و سێ تۆپی تاپرو پینج کەسی تۆپچی هاتن بـۆ کوردستان و چوونە شوینی مانەوەی سالآنەی سوپاو لەوێ دابەزین. خـەرجی خـۆراك و ئالیك و کریی گواستنەوەی جبەخانەو پیویستیەکانی ئـەم سـوپایە لـە سـالآنی پیشـوو

زیاتر بوو. هەر ئەم سوپایە بەوپەری ریکوپیکییەوە لەسەر سنوور جیگر بوو و کاروبارە سنوورییەکانی بە ئەنجام گەیاند. لە کۆتایی ئەم سالەدا زانایانی کوردستان دلیان لە (اقبال الملك) رەنجاو (شیخ محەمەد جەسیمی صدر العلما)و (مەلا عبدالرزاق)ی امین الاسلام و شیخ محەمەد رەزای (امین الشرع) لەگەڵ کۆمەلیکی تر لە زاناو ناودارو شیخ و موریدەکان باری سەفەریان پیچایەوەو بەرەو ئەسفەهان کەوتنەرێ. لە ئەسفەهان لە لایەن یاوەرەکانی (ظل السلطان)ەوە ئەوپەری ریزیان لیگیراو خزمەتیان کرا. هەموویان لە مالی (مشیر الملك) جییان کرایەوەو بوونە میوانی سفرەی حەزرەتی ظل السلطان. هەموو پیویستی و پیداویستییەکانیان لە خەزینەو چیشتخانەی حەزرەتی (ظل السلطان)ەوە دەدرا. پاش چوار مانگ کۆمەلیکی تر لە زانایان و پیاوماقوولانی کوردستان دووبارە بەرەو ئەسفەهان کەوتنەرێ. سەرۆکی زاناکان مەلا محەمەد سالحی (فخر العلما) بوو، سەرۆکی پیاوماقوولانیش (امان الله خانی وەکیل) بوو. ئەم مەلا محەمەد سالحی فخر العلمایە یەکیکە لە زانا گەورەکانی کوردستان و لە رادەبەدەر پاك و خواپەرست بوو. امان الله خانیش یەکیکە لە پیاوە ناسراوەکان و هەرچەند تەمەنی کەمە، بەلام زۆر داناو زیرەك و تیژبین و لەسەرخۆیە. بەهەرحاڵ شیخ (محەمەد جەسیم)ی صدر العلما لە لایەن حەزرەتی ظل السلطان ەوە نازناوی (حجة الاسلام)ی پیبەخشراو نزیکەی (۸۰۰) تمەن مووچە بۆ خۆیو کەسوکاری و شیخەکانی تر دانراو خۆشحاڵ و شادمان بەرەو کوردستان گەرانەوە. مەلا (عبدالرزاق)ی امین الاسلام کە داوای نازناوی (شیخ الاسلام)ی دەکرد لەوێ مایەوە. کاتی کە (حجة الاسلام) لە ئەسفەهانەوە کەوتەری، مەلا محەمەد صالحی فخر العلماو یاوەرەکانی لە شاری (قوم) بوون و چاوەریی ئیجازەی حەزرەتی ظل السلطانیان دەکرد کە رووبکەنە ئەسفەهان. پاش ماوەیەك روخسەتیان پیدراو بەرەو ئەسفەهان چوون و لە لایەن شاهەنشازادەوە ریزیان لیگیرا. هەموو ئەم کۆمەلە مەبەستیان لەسەرکار لابردنی اقبال الملك بوو. پاش سێ مانگ لە لایەن حەزرەتی ظل السلطان

دوه مەلا لطف اللەی شیخ الاسلامیش بانگکرا بۆ ئەسفەهان. لە چـواردەی مـانگی (ذی القعدة الحرام)ی سالی ١٣٠٤دا شیخ الاسلام لە ریگەی عیراقــەوە روویکـردە ئەسـفەهان. پاش گەیشتن و حەسانەوەی شیخ الاسلام لە ئەسـفەهان، شـازادەی مـەزن (عـەلی اکـبر خانی شرف الملك) یشی بانگکرد بۆ ئەسفەهان. شرف الملك لە سەرەتای مـانگی (ربیـع الاول)ی سـالی ١٣٠٥دا بـەرەو ئەسـفەهان کەوتـەرێ. لـەم سـالەدا اقبـال الملـك، مــیرزا یوسفی مشیر دیوانی کـردە وەزیـرو یەکـەم کاربەدەسـتی ویلایـەت کـە پیشـتر وازی لـە وەزارەت هینابوو. میرزا یوسفی مشیر دیوان پیشتر نازناوی وەزیری هەبوو. لـە کۆتـایی سالی ١٣٠٤دا نازناوی مشیر دیوانی پیبەخشـرا. بـە راسـتی ئـەم مـیرزا یوسـفە شـایانی پلەوپایەی زیاترە. بە هـەرحاڵ لـە شـەوی حـەڤدەی (ربیـع الاول)ی سـالی ١٣٠٥دا کـە شەوی جەژنی لـە دایکبوونـی حـەزرەتی پیغەمبـەرە، بـە پیـی راگـەیاندنی تەلـەگرافیك اقبـال الملـك لـە حکومـەتی کوردسـتان لابـراو حکومـەتی کوردسـتان کرایــە پاشـکۆی کرماشان و درا بە محەمەد حسین خانی (حسام الملك)ی ئەمیر تومــان، کـە یەکیکـە لـە سەرۆکەکانی تایەفەی (قەرەگوزلو) ی هەمەدان. اقبال الملك ئەم هەوالەی باس نــەکرد، بۆ بەیانی ئەو شەوە بۆ جەژنە پیرۆزە دانیشت و پیویستییەکانی جەژنی بە جیگـەیاندو لە کۆتایی رۆژدا ئەو مەسەلەیەی باسکرد. حسام الملك میرزا یوسفی مشیری دیوانی لـە فەرمانرەوایی خۆی ئاگادارکردەوەو تا گەیشتنی خۆی، کاروباری ویلایەتی بـەو سـپارد. اقبال الملك لە سەرەتای مانگی ربیع الثانی دا بەرەو تاران کەوتــەرێ. حسـام الملـك لـە ریگەی کولیاییەوە بەرەو کوردستان کەوتەرێ، میرزا یوسفی مشـیری دیـوان یـەکیك لـە کاربەدەستەکانی خۆی کە حاکمی ئەسفەند ئابـاد بـوو بـە مەبەسـتی پیشـوازیکردن لـە حسام الملك رەوانە کرد. رۆژی هاتنی حسام الملـك بـۆ کوردسـتان هـەر ئـەو کەسـە بـە سەرخۆشـی دەچیتـە حـوزوری، پـاش لیپرسـینەوە حسـام الملـك حالـەتی کـابرای بــۆ دەردەکـەوێو یەکسـەر بریـاری تـەمیکردنی دەدا، پـاش ئـەوەی (٥٠٠) دار لـە ژیرپیــی دەدرێ زنجـیری دەکـەن و دەیخەنـە زیندانـەوە. گەیشـتنی ئـەم هەوالــە بــە ویلایــەت

ئەوەندەی تر هەوالی زەبرو زەنگی حسام الملك ی زیادکردو خەلکی سامیان لینیشت.
لە رۆژی چواردەی ربیع الثانیدا حسام الملك گەیشتە دار الایالەی شار.

## باسی فەرمانرەوایی محەمەد حسین خانی حسام الملك ئەمیر تومانی قەرەگوزلو

هەر لە سەرەتای هاتنیەوە، لەسەر ریی هەر ریبواریــك راگـەیاندنیکی هەلواسـی کـە هەرکەسیك لەگەڵ یەکیکی تردا مشتومرو شـەکوایەکی هەیـە بیـترس و بیئـەوەی گـویٚ بداتە کەس با بیت بۆ (دار الحکومە)و باسیبکات. خەلکی لە هەموو لایـەکی ویلایەتـەوە دەستە دەسـتە هـاتن و کەوتنـە سـکالاّکردن و داوای حـەقی خۆیانیـان دەکـرد. حسـام الملك خۆیشی سەرپەرشتی وردو درشتی کاروبارەکانی دەکرد. بەندەی میژوونـووس لـە سەردەمی حکومەتی ئەودا هەموو کاتیك ئامادەو شـایەت بـووم. هیـچ کـاتیك حـوزوری ئەوم لە کۆمەلی خاوەن سکالاّو کیشە بەتالّ نەبینیوە. بیئەندازە سـەرم سـورمابوو کـە ئەم هەموو خاوەن کیشەو گرفتانە تا ئیستا لەکویٚ بوون. پاش حەوت یـان هەشـت رۆژ بریك پارەی لە میرزا یوسفی مشیر دیوان وەرگرت و بەرگی وەزارەتـی لەبـەرکرد. پـاش دوو رۆژ دیسان لەسەر دەرگای هەر ماڵ و مزگەوتیك، بەیاننامە هەلواسرا کە کەس بۆی نیــە دەســبخاتە وردو درشــتی کاروبــاری ویلایەتــەوە زانــرا، هەرکـــەس هـــەر داواو مەسـەلەیەکی هـەبیت دەبـیٚ بیـت و بـە خـودی حـاکمی رابگەیـەنیت. لـەم بەیاننامـەی دووەمەوە ئەوەی نەدەزانرا. ئیتر هەموو خەلکی ویلایەت پلــەو سـنووری کـاری خۆیـان دەزانی، لەم بەینەدا دەستیکی چەند دزیکی بریو فەرمانبەری نارد بۆ سـەقزو بانـە بـۆ ئەوەی حاکمی ئەو دوو شوینە بینن بۆ شار. ماوەی دوو مـانگ بـە ئـارەزووی خـۆی لـە کوردستاندا فەرمانرەوایی کرد. رۆژی (٣٠) مانگی جمـادی الثـانی سـالی ١٣٠٥ بـە پیـی فەرمانی هۆمایۆنی، هەموو ئـەو ویلایەتانـەی لـە ژیردەسـتی حـەزرەتی ظـل السـلطاندا بوون و لەهەر کوییەك لە لایەن ئەوەوە فەرمانرەوایەك دانرابوو لابرا. حســام الملـك یـش

لـه حکومـەتی کوردسـتان جیابوویـەوەو گەرایـەوە بـۆ حکومـــەتی کرماشــان. مــاوەی مانەوەیان لە کوردستاندا دوو مانگ و دە رۆژ بوو.

حسـام الملـك پیـاویکی گـەورەو دادپـەروەر بـوو، خـودی خـۆی سەرپەرشـتی وردو درشتی کاروبارەکانی دەکردو خەیالی گەورەی لەسەردابوو. کاتیك کە حســام الملـك لـە حکومەتی کوردستان لابرا، بە پیی فەرمانی حەزرەتی همایونی مـیرزا ئیـبراهیم خـانی نوری (نظام الدولە ئەمیر تومان) کـرا بـە فـەرمانرەوای کوردسـتان. لـە کۆتـایی مـانگی جماد الآخرەی ١٣٠٥دا لــە تارانـەوە بـەرەو کوردسـتان کەوتـەرێ، لـە دوانـزەی مـانگی رەجەبی هەمان سالدا گەیشتە دار الایالە سنە

باسـی رۆژگـاری ژیـان و بەرزبوونـەوەی محەمـەد ئیـبراهیم خـانی نظـام الدولــە لای دەولـەتی پایەبـەرزی ئـیران لـە (تـاریخ الاکـراد)دا کـە ئـەم بەندەیـە بـە دوورو دریـــژی نوسـیویە، کـراوەو لەبـەر ئـەوەی بونیـادی ئـەم (حدیقـەی ناصریـە)یـە لەســـەر کورتکردنەوەیـە لـیرەدا باسـنەکراوەو هیـوادارم ئـەم کورتەیـە لای خـاوەن راکـان پەسەند بیت.

لە بەرواری رۆژی شەممە (٢٦)ی مانگی محرم الحـرام ریکـەوتی (٥)ی بورجـی گـای سالی کەرویشك ١٣٢١ی کۆچی لە سنە بە پیی فەرموودەی جەنابی پایەبـەرز، ئەمجـەد عالی، ئاغای میرزا حبیب الله خان سەرۆکی گشتی گومرکـی کوردسـتان (دام اقبالـە) بـۆ جەنابی ریزدار (مسـیو دوکتورمـان) ئـەندامی دانشـگای بـەرلینی دەولـەتی شـکۆمەندی ئەلمانیا (نوسراوە).

# پەراویزەکان

١-لە دەستنووسەکەدا، لە پاڵ ناوی (ابو مسلم)داو لە نیوان دوو کەوانەدا نوسـراوە (مەرڤەزی- مروزی). بە پیی ئەو زانیارییانەی لە بـەرگی شەشـەمی فەرهـەنگی موعـین (فرهنگ معین)دا هاتووە، (مەرڤەزی) شاعیرو دانایەکی دیرینەو ناوی تـەواوی (خواجـە ابو العباس ابن حنوذ المروزی)یە، لە سەردەمی مـەئموندا ژیـاوە، بـەڵام پـەیوەندی بـە ئەبو موسلیمی خوراسـانییەوە نیـە. هـەروەها (د. عبدالحسـین زریـن کـوب) لـە کتیبـی (تاریخ ایران بعد از اسلام)دا بە دریژی باسی ئەبو موسلیم و ناوو ژیان و بزووتنەوەکەی دەکات و هیچ ئاماژەیەك بە پەیوەندی نیوان ئـەم دوانـە ناکـات. جگـە لەوانـەش وەکـو زانراوە ئەبو موسلیم بە دەستی (ابو جعفر المنصور)ی خەلیفەی دووەمی عەباسـیەکان کوژراوەو سەردەمی (مەئمون)ی نەدیوە، بروانە: د. محمد معین، فرهنگ فارسـی، ج ٦، ص ١٩٥٨، مؤسسـە انتشـارات امـیر کبـیر، چـاپ چـهاردهم ١٣٧٨؛ هـەروەها: د. عبدالحسین زرین کوب، تاریخ ایران بعد از اسلام، چاپ بنجم ١٣٦٨، مؤسسـە انتشـارات امیر کبیر، ص ٣٩٣-٤٠٢.

٢-لـە دەقەکـەدا نووسـراوە (چنکیریـان). سـەبارەت بـەم نـاوە هیـچ زانیاریـەکم دەستنەکەوت. بـەڵام ئەگـەر نووسـەرەوەی دەستنووسـەکە بـە سـەهو وای نووسـیبیّو مەبەسـت (چـەنگیزیان) بیـت، واتـە چـەنگیزخان و دەسـتوپیوەندەکانی، ئـەوا دەبـیّ ئاماژە بەوە بکەین کە چـەنگیزخان لـە نیـوان سـاڵانی (٦١٦-٦١٨)ی کۆچیـدا ئـیرانی داگیرکردووە. واتە پـتر لـە (١٠) سـاڵ پـاش ئـەو میـژووەی دەستنووسـەکە بـۆ مردنـی ئەردەڵان دەستنیشانی کردووە. (فرهنگ معین، ج ٥، ص ٤٤٤).

٣-دلنیا نەبووم لەوەی ئەم ناوە (عەلی شەکر)ە، یاخود (عەلی شوکور) بۆیـە وەکـو خۆی نووسیمەوە.

٤-ئەم وشەیە لە دەستنووسەکەدا بەم شیوەیە نوسراوە: (نماید) کە مانای (دەنوینێ، یاخود دەردەکەوێ) دەگەیەنێ. بەڵام دیارە ئەم وشەیە لەگەڵ مانای دیرەکەدا ریکناکەوێو دەبێ یا (نماند: نامینیتەوە) بیت، یاخود (نباید: نابێ) بیت.

٥-بە پیی ساڵ و سەردەمی حوکمرانی مەئمون بەگی دووەم (وەکو لە دەستنووسەکەدا هاتووە)، دەبێ مەبەست (سلیمان)ی کوری (سەلیمی یەکەم) بیت کە بە (سلیمانی قانونی) ناسراوە (٩٢٦-٩٧٤ك، ١٥٢٠-١٥٦٦ز).

٦-شاتەهماسب: کوری شا ئیسماعیلی یەکەم و دووەمین پاشای سەفەوییە (٩٣٠-٩٨٤ ك، ١٥٢٤-١٥٧٦ز).

٧-ئەلقاس میرزا: کوری شا ئیسماعیلی یەکەم و برای شاتەهماسبی سەفەوی. لەگەڵ (سام میرزا)ی برایدا لە شا تەهماسب هەلگەرانەوە. لە سالی (٩٦٩ك)دا سام میرزا گیراو ئەلقاس میرزا پەنایبردە بەر سولتان سلیمان لە ئەستەموولّ. پاشان لەگەڵ لەشکریکی عوسمانیدا پەلاماری دەولەتی سەفەوی داو سەرەنجام لە سالی (٩٤٦ك)دا بە دەستی (بارام-بەهرام)ی برای گیراو لە قەلاّی (ئەلەموت) توندکراو، هەر لەویش کوژرا.

٨-شا ئیسماعیلی دووەم: کوری شا تەهماسبی سەفەوی: پاش مردنی باوکی لەگەڵ (حەیدەر میرزا)ی برایدا لەسەر تەختی پاشایەتی تیکچوو. بەڵام حەیدەر میرزا کوژراو ئیسماعیل لە سالی (٩٨٤ك، ١٥٧٦ز)دا چووە سەرتەخت،. لە مەزهەبی شیعە هەلگەرایەوەو لەگەڵ دەولەتی عوسمانیدا ریککەوت. بەڵام پاش سالیك، واتە لە سالی (٩٨٥ك، ١٥٧٨ز)دا مردو برا گەورەکەی (واتە محەمەد میرزا) کە بە سولتان محەمەدی خودابەندە بەناوبانگە چووە سەر تەختی سەلتەنەت.

٩-مەبەست سولتان موورادی سییەمە، کە لە سالی (٩٨٢ك)دا چۆتە سەرتەخت و لە سالی (١٠٠٣)دا مردووە.

١٠–له دەستنووسەکەدا دوو جار (شارباژێر) ناوی هاتووە. جارێك وەك ئەو بەشـەی بەر بوداق بەگ کەوتووە، جارێکیش هی میر عەلەمەددین. دیارە دەبێ یـەکێکیان هەڵـە بێت. زۆرتر وا پێدەچێ (شارباژێر) بەشە مولکی میر عەلەمـەددین بێـت. چونکـە تەنـها ئەو ناوچەیە بەر ناوبراو کەوتووە. جگە لەوەش لەو شوێنەدا کە دەستنووسـەکە بەشـە مولکی بوداق بەگی دەستنیشانکردووە، نیوە خەتێك بەسەر ناوی شارباژێردا هاتووە.

١١–ئـەم نـاوە لـە دەستنووسـەکەدا (سـپاە منصـوری) نووسـراوە. دوور نیـە (سیامەنسوری) بێت.

١٢–دەبێ ئەم ژمارەیـە هەڵـەی نووسـەرەوەی دەستنووسـەکە بێـت و راسـتیەکەی سـاڵی (١٠١٢ی کۆچـی) بێـت. چونکـە نوسـەر خـۆی لـە سـەرەتادا نووسـیویەتی کـە هەڵۆخان لە سـاڵی ٩٩٦ی کۆچیدا بـووە بـە فـەرمانرەوا. پاشـتریش دەڵێـت لـە سـاڵی ١٠١٤ی کۆچیدا، (خان ئەحمەد خان)ی کوری چۆتە شوێنی.

١٣–شا عەباسی کـوری (محەمـەدی خودابـەندە)و ناسـراو بـە شـا عەباسـی گـەورە (کبیر)، لە ساڵی ٩٩٦ی کۆچیدا چووە سەرتەخت و لە (١٠٣٨ك–١٦٢٩ز)دا مرد.

١٤–خلعت: بەو جلوبەرگە تایبەتە گوتراوە کە پاشا یاخود پیاوی گەورە بـە دیـاری بەخشیویانە. هەروەها لە کاتی دانـانی حاکمـەکاندا، لەگـەڵ فـەرمانی شـادا جلوبـەرگی تایبەت– یش بە حاکمی تازە دانراو بەخشراوە. واتە فەرمان و بەرگ پێکەوە دراون بـە حاکمی دانراو.

١٥–دەبێ لێرەدا هەڵەیەك هـەبێت، چونکـە وەکـو زانـراوە لـە دەوروبـەری رەوانـدز دەریـای لێنـەبووەو نیـە. رەنگـە راسـتەکەی (روبـار) بێـت نـەك دەریـاو نووسـەرەوەی دەستنوسەکە هەڵەی تێدا کردبێت.

١٦–لـە دەستنووسـەکەدا (خوشـنان) نووسـراوە، رەنگـە مەبەسـت ناوچـەی خۆشناو بێت.

١٧–دەرگەزین: گوندێکە دەکەوێتە نزیك شاری هەمەدانەوە.

١٨–میر ئاخورباشی بە کەسیك گوتراوە کە سەرپەرشتی تەویلەو خزمەتی ئەسپەکانی پاشای کردووە.

١٩–(شا سلیمان)ی یەکەم، کوری شا عەباسی دووەم کە هەشتەمین پاشای سەفەویەو لە نیوان سالانی (١٠٧٧–١١٠٥ك)، (١٦٦٧–١٦٩٤ز)دا حوکمی کردووە.

٢٠–پیدەچێ لیرەدا نوسەرەوەی دەسنووسەکە بە هەلەدا چووبێ. چونکە شاسەفی لە سالی (١٠٥٢ك–١٦٤٢ز)دا مردووەو لە سەردەمی خان ئەحمەد خاندا نەژیاوە. هەر خودی دەستنووسەکەش، لە رستەی دوای ئەم رستەیەدا هەلەکەی راستکردۆتەوەو لەبری شاسەفی نووسیویەتی: "شا سلیمان حکومەتی کوردستانی بە خەسرەوخان سپارد..".

٢١–شا سولتان حسین: لە سالی (١١٠٥ك–١٦٩٤ز)دا چووە سەرتەخت. لە سالی (١١٣٥ك، ١٧٢٢ز)دا دەستی لە حوکم هەلگرت و لە سالی (١١٤٢ك)دا کوژرا.

٢٢–دیسان لیرەشدا ناوی شاسەفی هاتووە کە دیارە هەلەیەو دواتر دەستنووسەکە خۆیشی راستیکردۆتەوە کە دەلیت ".. بە فەرمانی شاسولتان حسین" نەك شاسەفی.

٢٣–پیدەچێ نووسەر لیرەدا بە هەلەدا چووبیت. چونکە وەکو لە (فەرهەنگی فارسی موعین)دا هاتووە، کیشەی ئەفغانیەکان لە قەندەهار، لە سالی ١١٣٤ی کۆچیدا دەستپیکردووە. لە سالی ١١٣٥ی کۆچیدا لەشکری (مەحمودی ئەفغان) شاری ئەسفەهانی گرتووەو (شاسولتان حسین)یش بە دەستی خۆی تاجی پاشایەتی تەسلیمی مەحمودی ئەفغان کردووەو کردویتی بە کوری خۆی.

بروانە: د. محمد معین، فرهنگ فارسی، ج ٥، ص ٤٦٢، ج٦، ص ١٩٢٩–١٩٣٠، چاپ چهاردهم، نتشارات امیر کبیر، تهران ١٣٧٨. (ل ٢١).

٢٤–نووسەر چەند دیریك لەمەوبەرو لەمەودواش دەلیت کورەزای کەلبعەلی خانە نەك ئەحمەدخان.

٢٥—له دەستنووسەکەدا ناوی (خانه) پەریوەو تەنها نوسراوه (پاشـای پسـر محمـد پاشای بابان). بەلام وەکو دواتر دەردەکەوێ ئەم پاشایه، مەبەست (خانه پاشا)یه.

٢٦—ئەم دەستەواژەیه له دەستنووسەکەدا بەم شیوەیه نووسراوه: "بقانون کـردی وا هلیـت رفتـار مینمـود". وشـــەی (کــردی) بـــه دوو شـــیوه دەتوانـــین بخوینینـــەوه. یەکـەمیان— وەکـو خـۆی کـه دەکاتـه (کـوردی، کوردانـه). دووەمیـــان— لەبەرئـــەوەی دەستنووسەکه کۆنەو بـه پیـی رینووسـی کۆنـی فارسـی نووسـراوه، لـەم رینووسەشـدا هەردو پیتی (ك) و (گ) به یەك شیوەو به (ك) دەنووسـرین، بۆیـه دەشـی ئـەم وشـەیه (گردی) بیت که مانای (پالەوانی، دلیری، جوامیری) دەگەیەنێ.

٢٧—ذرع: گەز، پیوەریکه بۆ پیوانەکردنی دریژی، دەکاته (١٦) گرێ، یاخود (١٠٤) سانتیمەتر.

٢٨—مەن: سەنگیکی کیشانی قورساییه، دەکاته نزیکەی ٣ کیلۆ گرام.

٢٩—نووسەر شوینی ئەم ناوەی به بەتالی هیشتۆتەوه.

٣٠—ئـەم رسـتەیه نـاریك و ناتـەواوه نـاوی شـوینی سـەفەرەکەی (نادرشـا)یـش لـه دەقەکەدا نیه، دەقە کوردیەکەشی زۆرتر به مەزەنده داریژراوه.

٣١—وشەی (سالْ) له دەستنووسەکەدا پەریوه.

٣٢—بەگلەربەگی: وشەیەکی تورکییەو مانای (بەگی بەگەکان) دەگەیەنێ. له ئیراندا به مانای گەورەی شار یـاخود سـەرۆکی کویخـاو موختارەکـانی شـار بـەکارهینراوه. لـه سەردەمی سەفەویەکاندا به مانای حاکمی ویلایەت و له سەردەمی قاجاریشدا به مانـــای سەرۆکی پۆلیسی شار یاخود حاکمی عەسکەری شار بەکارهینراوه.

٣٣—ئـەم رسـتەیەش لـه رووی دارشـتنەوه نـاریك و ناتـەواوەو جۆریـك تـەمومژ لـــه ماناکەیدایه. هەروەها لیرەدا ناوی ئەم حاکمـه نوییـه (حسـین عـەلی) نووسـراوه، بـەلام پاشتر و پاش چەند دیریك ناوەکه بووه به (حەسەن عەلی).

٣٤–د. محەمەد موعین لە فەرهەنگە فارسیەکەیدا بەم شیوەیە باسی کەریم خـان و شەرەکەی لەگەڵ عەلی مەردان خاندا دەکات: بە ماوەیەك پاش مردنی نادرشا، کـەریم خـان لەگـەڵ عـەلی مـەردان خـانی بـەختیاری و ئـەبولفوتوح خـاندا حکومـەتیکی سـێ لایەنەیان لە ئەسفەهان پیکهیناو کورەزای شاسولتان حسین–یان لەسەر تەخت دانا بـە نـاوی (شـا ئیسـماعیلی سـییەم)ەوە. لـە ئـەنجامدا عـەلی مـەردان خـان بـوو بـە (نـایب السلطنە)، کەریم خان فەرماندەی سوپاو ئـەبولفوتوح خـان حـاکمی ئەسـفەهان. بـەڵام عەلی مەردان خان پەیمان شکینی کردو ئەبولفوتوح خانی کوشت. خۆیشی پـاش چـەند شەریك لەگەڵ کەریم خاندا، تیکشکاو دەسەڵات کەوتە دەست کـەریم خـان. بروانـە: د. محمد معین، فرهنگ فارسی، ج٦ اعلام، ص ١٥٧٣.

٣٥–نواب: لە ئیرانی کۆندا نازنازی شازادەکان بووە.

٣٦–زەنبورەك: جۆریك تۆپی بچوك بووە، لەسەر پشتی حوشتر بەستراوە.

٣٧–ازهر چە بکذری سخن دوست خوشتراست:

٣٨–کرور: واتە پینج سەد هەزار.

٣٩–ترخـان: نازناویکـە لـە سـەردەمی پاشـاکانی مـەغۆلدا بـە هـەندێ شـازادەو گـەورەپیاوان دەبەخشـران. ئـەوی ئـەم نازنـاوەی وەردەگـرت، بـاج و خـەراجی لیوەرنەدەگیرا.

٤٠–ئاغا محەمەد خانی قاجـار: دامەزرینـەری حوکمرانیـی قاجاریەکانـە لـە ئـیراندا. سالی ١٢٠٩ی کۆچی چۆتە سەرتەخت و لە ١٢١١ی کۆچیدا مردووە.

٤١–شاطر باشی: بەو سەربازە پیادانە گوتـراوە کـە بـە جلوبـەرگی تایبەتـەوە، لـە پیش پاشا یاخود میرەوە رۆیشتوون.

٤٢–مانای شیعرەکە:

**لەو نەبەردەدا ئەو شیرە هێژایە — بە شمشیرو خەنجەرو بە گورزو کەوان**

**کوشتیو بریو تیکی شکاند — سەرو سنگ و دەست پیی شیران**

٤٣–جۆریکه له خەت و نووسینی فارسی بە شێوەیەکی هونەری، لە دوو وشەی (نسخ) و (تعلیق) ئاویتەکراوە.

٤٤–ئەم ناوه له دەستنووسەکەدا بە ناتەواوی نووسراوە. واتە تەنها نووسراوە (سەر).

٤٥–لە دەستنووسەکەدا نووسراوه (خوی) کە شاریکه لەناو ئیراندایە رەنگە راستەکەی (کۆیە) بیت.

٤٦–لە دەستنووسەکەدا نووسراوه (عەبدوللا پاشا..)، بەلام بە پیی مانای رستەکەو رەوتی باسەکە، دەبێ وشەی (پیشقەراولان) پەرییبیت.

٤٧–لیرەدا جیگەی وشەیەك بە بەتالی ماوەتەوە.

٤٨–پیشکار: دەمراست– بە کەسیك گوتراوه کە کاروبارەکانی پیاویکی گەورەی بەریوەبردووە. بە مانا هاوچەرخەکەی دەکاتە (سکرتیر).

٤٩–مانای شیعرەکە:

**دەورانی بەقا (رۆژگاری ژیان) وەك (با)ی بیابان دەروا**

**چاكو خراپو جوان و ناشرین دەروا**

٥٠–منشی: نووسەر، کاتب.

٥١–ناسرەدین شا: چوارەمین پاشای قاجار، سالی ١٢٦٤ی کۆچی (١٨٤٨ز) پاش مردنی باوکی (محەمەد شا) چووە سەرتەخت. سالی ١٣١٤ی کۆچی (١٨٩٦ز) کوژرا.

٥٢–میرزا تەقی خانی ئەمیر کەبیر: بە یەکیك له سیاسەتمەدارە وریاو ناودارەکانی سەردەمی قاجار دادەنریت. له سەردەمی ناسرەدین شادا بوو بە سەدری ئەعزەم و کەوتە ریکوپیك کردنی ئیداریو عەسکەری ولات، (دار الفنون)ی دامەزراندو لە ئەورووپاوه مامۆستای هینا بۆ ئیران. سەرەنجام نەیارەکانی (ناسرەدین شا)یان لی هەلگەراندەوە. سەرەتا لەسەر کار لابراو دواجار له سالی ١٢٦٨ی کۆچیدا کوژرا.

٥٣–یاوەر و سەروان: دوو پلەی سەربازین کە رەنگە بە مانا ئەمرۆییەکەی بکاتە سەروان: ملازم یاوەر: رائید.

٥٤–چریك: تفەنگچی خۆبەخشی عەشایەر.

٥٥–ئەم وشەیەم بۆ نەخوینرایەوە.

٥٦–ئەم ناوەم بە تەواوی بۆ ساغ نەبۆوە، بۆیە وەکو خۆی نووسیمەوە. لە دەستنووسەکەدا جاریك (تقود) نووسراوەو جاری دووەمیش (نقود).

٥٧–بابییە: لایەنگرانی (باب: سەید عەلی محەمەد شیرازی ١٢٣٥– ١٢٦٦ك). باب لە سەرەتادا بانگی بۆ مەزهەبیکی نوێ هەلدەدا کە بە (بابییە) ناسراوە. پاشان لافی ئەوەی لیدەدا کە (مەهدی)یە. سالی (١٢٦٦ك) پاش ئەوەی زانایانی ئایینی حوکمی کوشتنیان دا، تیرباران کرا.

٥٨–میرپنج: واتە (میری پینج)، پلەیەکی سەربازیی سەردەمی قاجارەکانی ئیرانەو بە فەرماندەی (٥) هەزار سەرباز گوتراوە.

٥٩–مەن: یەکەی پیوانی کیشەو دەکاتە (٣) کیلۆ.

٧٠–شاهی: ٠،٢ ی ریالیکە.

٦١–عەباسی: (٥٠) عەباسی، یەك تمەنە.